**جووته‌ی هه‌نجیران:** دوو ئه‌ستێره‌ن لـه ته‌نیشت یه‌كه‌وه وه‌ک چزوو وان بـۆ چه‌ند ئه‌ستێره‌یه‌كی، كه‌وه دووپشـک ده‌چن كـاتێكی لـه ئێوارانـدا ، كـه كه‌وتنه لای باشوورئیتر ئه‌وه هه‌ره‌تی هه‌نجیر گه‌یشتنه.

**جووتباقیه:** جووره دروومانێكه، (هه‌ورا.) سه‌رتیری.

**جووتبه‌نده:** فه‌له‌خووێ، جوتێر.

**جووتبه‌نده‌یی:** فه‌له‌خوویی، جوتێری.

**جووتبوون:** دۆست و ئاشتبوون، له‌ته‌نیشت یه‌كتری ته‌رازبوون، له‌گه‌ڵ ژنـی خۆ نوستن، رێک و ته‌راز بوونی دووچت به‌قه‌د یه‌كتری.

**جووتخاڵ:** جوت‌ته‌خاڵ: (:).

**جووتكه:** جووت، دوو.

**جووتكه‌ی برادەران:** (هه‌ورا.) دووبراڵه.

**جووتكه‌ی خاڵان:** دووخاڵ.

**جووتكردن:** به‌جووت كێڵانی زه‌وی و زار. پێوه‌دان و داخستنی ده‌رگاو په‌نجه‌ره‌ی دووده‌ری. دوو یا چه‌ند چت خستنه پاڵ یه‌كتری.

**جووتلانه** (شا.): دووانه.

**جووتگرتن:** پێكگه‌یشتنی نێره‌ومێیه.

**جووتلقه:** جووته، له‌قه‌ی یه‌كسمانه به هه‌ردووک پاشووه‌كانی.

**جووتلووله:** جووره تفه‌نگێكی دوو لووله‌یه.

**جووتماشه:** مرازێكی كه‌ژمێرییه.

**جووتن** (باک.): جووین.

**جووتێ** (هه‌ورا.):(هه‌ورا.) دووانێ، دووانه.

**جووتیار:** كه‌سێكه بـۆ خـۆی یـا بـه‌كرێ و به‌مانگانه یـا بـه ساڵانه جووتـی بكات، جوتێر، جوتبه‌نده، جوتكار، جووره ئه‌ستێره‌یه‌كه.

**جووتیاری:** پیشه‌ی جوتێری، جوتكاری.

**جووتێر:** جوتیار، جفتیار، جوتبه‌نده. ـــ ی: جوتیاری، جفتیاری.

**جووجه:** جووچكێكه، كه‌كزر بووبێ و هێشتا نه‌بووبێ به بارۆكـه، جووجـوو، جووجک، جووجیله.

**جووجه‌ڵه:** جووجیله.

**جووجه قۆره:** فرووجاوێكه به قۆره (به‌رسیله) دروستكرابێ.

**جووجه‌ڵه:** جووچكی مریشكانه.

**جووجه‌ڵه هۆر ناووردەی** (هه‌ورا.): جووجیله هه‌ڵێنان.

**جووجه‌ڵۆک** (باک.): جووجیله‌ی مریشک.

**جووجه‌ڵێ** (هه‌ورا.): جووجیله.

**جووجک** (باد.): جووچک، چۆله‌كه. (فه.) جووجیله.

**جووجكه:** (زاخ. ، ده‌ۆ. ، باد.) چۆله‌كه، كیژووله. جووچكه، جووجه‌ڵـه، جووجه.

**جووجكه‌برپاگ:** دوابراو، كلک براو.*

**جووجوو:** ووته‌یێكـه منداڵـی سـاوا بـه‌كاری دێنـێ بـۆ هـه‌موو گیـانداری‌كی گچكـه، جووجـه جانـه‌وه‌رێكی گچكه‌یه.

جووجیله

**جووجیله:** جووجه‌ڵه، جووچک، جووچكه، جووچكه‌ی مریشكییه.

**جووچک** (مـوک.): نێـک، كۆجه‌ڵـه‌ی سمـتی، كووچه‌ڵـه. جووجه‌ڵـه، جووچكه، منداڵ، زارۆ، به‌چه، به‌چكه.

**جووچكه:** (بـاد.) چیچـه‌ڵۆک، جووجـه، جووجیلـه. منـداڵ، زارۆ، به‌چـه، به‌چكه.

**جووحه** (جووعه) (هه‌و.): زۆرزان.

**جوود:** كێوێكی ناوداره لـه سـه‌ره‌وه‌ی جزیر و بۆتانێدایه گۆیا كه‌شتی نوح له‌سه‌ر وێ راوه‌ستاوه.

**جوودی:** بروانه: جوود.

**جوور:** (هـه‌ورا.) جۆر، چه‌شن، ته‌رز، تزبوور، مـه‌هدار. بـه‌و ـــ ه: بـه‌و چه‌شنه، به‌وشێوه‌یه، هه‌نگووره، ئاوا، ئه‌ئاوا، وسان. چ ـــ : چۆن، چلۆن، چاوا، چاڤا؟، (لو. ، فه.) وه‌كوو، وه‌ک، جوورمن: وه‌ک من.

**جوورا** (باک.): چوورره، جووره، باڵنده.

**جووراو:** جوواو، چتێكه وه‌كوو بنیشت و ئیتر له‌ده‌مدا جووراوبێ.

**جووراوه:** ئاسنێكه، كه زه‌ده‌دارو گرنج گرنـج بووبێ بـه هـۆی لێـدان یـا پێدا كه‌وتنی چتێكی قورسه‌وه.

**جووراوجوور:** جوورجووره.

**جوورک:** جۆرک، باڵنده‌یێكه لـه ئـاوی داده‌ژی ئـاواڵی مراوییـه‌و وه ویش ده‌چێ.

**جوورکردن:** سه‌ندنی چتێک له یه‌كێک به قومار یا به فرۆفێڵ.

**جووری:** به‌شوێنداگه‌ڕان، داواكردن.

**جوورێ** (باک.): نێوی گوڵێكییه په‌نبه‌یی و سووره. نێوی ژنانه.

**جووریان:** گۆران، جووربه‌جووربوون. (ئه‌رده.) په‌شۆكان.

**جووز** (ئه‌رده.): جووره ، ده‌نگی تڕ. (بـاک.) گه‌مه‌یه‌كـه، (شا.) جه‌خز، جخز، جغز، جه‌غز.

**جووزان** (ئه‌رده. ، باک.): گووێزان، جۆزان.

**جووزه:** ده‌نگێكی باریک و گچكه‌یه وه‌كـوو گیـزه‌ی سـه‌ماوه‌ری، (ئـه‌رده.) ده‌نگی تڕه.

**جووزه‌جووز:** گیزه‌گیز.

**جووزه‌رد:** جووزه‌ردان، مانگێكی جۆی تێداپێبگات.

**جووزه‌ڵه:** دووزه‌ڵه.

**جووزپێوه‌كردن:** بزپێوه‌كردن.

**جووش** (ئه‌رده.): گرمژه، جۆش، پیزووكه، زووه، هه‌ڵزریان. هه‌ڵقوڵین. خه‌ڵفی دارو دره‌ختانه كه له‌بنه‌وه ده‌ری ده‌كات. چه‌سپ، له‌حیم.

**جووشانه:** هاتنه‌كوڵ، وه‌كوڵ هاتن.

**جووشاندن:** جۆشدان، كوڵاندن.

**جووشانن:** جۆشدان، كوڵاندن.

**جووشخواردن:** جۆشین.

**جووشدان:** چه‌سپاندن، چه‌سپانن، چه‌سپكردن.

**جووشیان:** ئـاره زوو وتـاره‌كردن، تـا ـــ خۆری. كوڵان، قوڵتدان، قولیـان، قولدان، هه‌ڵقوڵین (بۆئاو)، (ئه‌رده.) هه‌ڵژلیـویان، هه‌ڵشێوان.

**جووغه** (خۆ.): مه‌ڕەزا.

**جووف:** (باک.): چۆم.

**جووق** (فە.): گوند، دێ، (ئەردە.) جوقە، گەل، دەستە، گرۆ.

**جووقە** (هەورا.): قامکە ئەستوور و ڕاستەکەی پشتەوەی دەستەکانی کەڵەبابی ومریشکانە شەڕی پێدەکەن. (ڕۆژ.) جوکە، جیکە.

**جووقەجووق** (ڕۆژ.): جیکەجیک، جوکەجوکی باڵندانە.

**جووقەشینکە** (بابا.): باڵندەییکە.

**جووقەجووق:** (ئەردە.): دەستەدەستە، گەلگەل.

**جووقلی** (بابا.): گچکەو نابووت و پەرپووت، نالەبار، جوورەپۆتە.

**جووقن:** جوقنە، فیقن، لەرک، سیخن، چرچ و لەڕ و نابووت.

**جووک:** چووز(بز) ێکە بە یەکێکەوە دەکرێ، جووکە. جۆگەلە، جوکی.

**جووکاندن:** جیکەکردنی چۆلەکە و ئیتر، جووقەکردن.

**جووکە:** جیکە، دەنگی پەڕەوور و ئیتر، جووقە، جیکە، جرووکە.

**جووکە بڕین:** مەبەس لە بێدەنگ و کپ و خامۆشکردنی زیندەوار یاکەسێکییە.

**جووکەجووک:** جیکەجیک، جرووکەجرووک: جوقەجووق، دەنگی چۆلەکە و جوجیلە و ئیترە.

**جووک پێوەکردن:** جونگپێوەکردن.

**جووکن:** گیاندارێکە زۆر بجووکێنی. ووزەووزکەر.

**جووکی:** کەسێکە، کەبەفرۆفێڵ مەردوم هەڵخەڵەتێنێ و چاوبەستی لێبکات و نوشتووی ڕەشی و دێو بەندو چتی هیچ و پووچی بۆبنووسێ، جادووباز، جادووگەر. جووک.

**جووگە:** جۆگە.

**جووگەبار:** جۆبار.

**جووگەلە:** جۆگە، جۆ، جۆی.

**جووگەلانە** (کۆ.): دووانە.

**جووڵان:** بزووتن، لڤین، لڤیان، وەرزین، لپان، ڤرڤرین، لەبتین، جڤان، چرچەکردن، ڤەخومین، لەخشبوون، (کە.) خێزان، بزڤان، جەمجقین، وەرزان، (لو.) ئاخێزکردن، جم، جم و جووڵکردن.

**جووڵانەوە:** بزوتنەوە، هەژان، وەرزانەوە. نرخپتر بوونی چت ، نرخی گەغی جوولاوەتەوە واتە بەرەو ژوورر چووە. ڤرڤرین.

**جووڵاندن:** جوولاندن و بزواندنی چتە لە شوێنی خۆی، مەراندن، جڤاندن، ڤرڤراندن، وەلەرزە خستن، هەژاندن، لەبتاندن، جماندن، (باک.) ڤەخویاندن، بزڤاندن، چاپاندن، جەمجقاندن.

**جووڵاندنەوە:** بزواندنەوە، تەکان پێدان، لقلقاندن.

**جووڵانن:** جوولاندن.

**جوولایی کەرە:** جاڵجاڵۆکە.

**جووڵە:** هەژان، (لو.) جوولان، لەرزە، ئاخێز، (گۆ.) فرزە، لەخش، بزاووز.

**جووڵەجووڵ:** جوولەی یەک لە دووای یەکتری، لەرزە لەرزە، بزاووز.

**جوولەکانی:** جووانی، زمانی جوولەکان.

**جوولەکە:** جوو، جهوو، کەسێکە لەسەر ئایینی مووسابێ.

**جووڵەکردن:** جوولانەوەی چت.

**جووڵە مەڕەسێ:** جوورە گەمەیەکە، کەبەجگ دەکرێ.

**جوولبڕ** (باک.): قرژاڵ.

**جوولک** (ئەردە.): جوجەڵە.

**جوولگ** (هەورا.): جۆلاَ.

**جووڵگی** (هەورا.): جۆلایی.

**جوولیان** (ئەردە.): جوولان.

**جوولیانەوە** (ئەردە.): جوولانەوە.

**جووڵین:** بزوێن، جووڵێنەر، ڕاژێن، (باک.) ڕاژێنەر، بزڤانۆ.

**جووڵێنەر:** جووڵێن.

**جووم** (بار.): تیرە، قۆڵ، دەستە، تووش، (باد.) چیمەن یا شیناییێکە کەمێک یا گەلێکی ئاوەدە بندابێ، کە ڕۆژی لێدا بترووسکێ، زەوییێکی ڕاست و تەرازە.

**جوومار** (هەو.): شینی گایان گێو، (هەورا.) کەوەمار، جوورە مارێکە.

**جوومال:** جۆماڵ، جویمال.

**جوومە** (فە.): کراسی ئافرەتانە.

**جوومەرد** (زا.): جووامێر.

**جوومەکار** (باک.): تەوونگەر. ـــ ی: تەوونگەری.

**جوومەکڤان** (باک.): تەوونگەر. ـــ ی: تەوونگەری.

**جوومجومە:** جمجمەی سەری، مەژالک.

**جوومێ:** هەرێمێکی کوردستانە لە ڕۆژاوای باکووری شاری حەڵەبێ هەموو دانیشتوەکانی کوردن.

**جوون:** ددان بە چتێکدانان بۆووردکردنی ، جووین، جاوین، جاکاندن، جوتن. (ڕەوا.) دۆڵی بەردە، کەچتی تێدا دەکوترێ، (هەو، موک.) جۆنی، (هەورا.) دۆڵ. جنێو. جۆر، جوور. (کۆ. کە.) کۆمەڵە، دەستە، تاخم، بۆ مرۆ و وولاغ و چتمەکان. (هەر.) بەش، پشک. پارچە. تروسکەی ئاوێیە لە نێوشیناوەردیدا، کەمەتاو لێیبدات. (باک.) بۆر، ڕەنگی بۆر.

**جوونایی:** بۆری، بۆرایی.

**جوونە:** بروانە: جونایی.

**جوونەوە:** زەدەداری و گرنج گرنج بوونی ئاسن و تەنەکە و چتی تر بە هۆی لێدان یان بەسەرداکەوتنی چتی قورسەوە.

**جوونگ:** توڕەیی، ڕق. *

**جوونگە:** دەنگی باریکی ناخۆش، جووکە. *

**جوونگەجوونگ:** جووکەجووک.

**جووێ:** جودا، جیا، جیاواز. بەـــ : (کە.) وەجووێ. (دەر.) چۆ.

**جووێبوونەوە:** جیابوونەوە، دوورکەوتنەوەی چتێک لەچتێکی تر، دابڕان، ژێ قوتبوون، ژهەڤبوون، لێبوونەوە.

**جووێ جووێ:** جودا جودا.

**جووێک** (ڕۆژ.): دووانە.

**جووێ کردنەوە:** جیاکردنەوە، دوورخستنەوەی چتێک لە چتێکی تر، هەڵاواردن، قەتکرن، گەمراندن، ژهەڤگرتن، دابڕین، پچەڕاندن، پچەڕین، (باک.) جووێلەک. چینی دەستکورت و هەژاران.

**جووێن:** جوون، جنێو، دوژێن، دژمان.

**جووێندان:** جنێودان.

**جووێنفرۆش:** جنێوفرۆش.

**جووێنفرۆشی:** جنێو فرۆشی.

**جووینە:** داخوواز، جوویا.

**جوویین:** جوونی چت لەزاردا. جاوین، جوولان، (فە.) جایین، جوون، جاکاندن، جووتن، (هەورا.) ژاوین، ژاوای، پاروو و چتی تر بەددان ووردکردن.

**جوویین منالْ:** جوولانەوەی منالْ.

**جە** (باک.): جێ، جێگا. ــ بوون، جێبوون. ــ کرن: جێکردن.

**جهار** (باک.): توورەکەی ئالیکی وولاخان، (باک.) جهوەر.

**جهاز** (باک.): جیازی بووکان.

**جهال** (باک.): جحێڵ، جووان، (باد.) جان.

**جهان:** جیهان، گێتی.

**جهە** (باک.): جۆ.

**جهەرگین** (باک.): ژووانگە، جێگایەکە پەیمانی دیدەنی تێدا بدرێ.

**جهتەنگ** (باک.): جێگای تەنگ.

**جهتەنگی** (باک.): تەنگەبەری.

**جهتک** (باک.): جووت؛ ــ گۆرەوی: جووتە گۆرەوییێک.

**جهدار:** جێگر. ــ ی: جێگری.

**جهدە** (باک.): دەست بەجێ.

**جهدەرک** (باک.): جێگای چوونەدەر.

**جهزا** (باک.): خۆجیی، هاوولاتی. ــ یی: خۆجێییەتی، هاو وولاتێتی.

**جهک** (باک.): جێگای چکۆلە.

**جهگیر** (باد.): جێگر، تازە جێگر، تازە دانیشتوو، کەسێکە بەتازەگی چووبێتە شوێنێکی تازەو تێیدا دانیشتبێ.

**جهگیری:** جێداری.

**جهنی** (باک.): جۆنی.

**جهوو** (باک.): جوولەکە.

**جهوەر** (باک.): توورەکەی ئالیکی وولاخانە.

**جهوورک:** جۆرک، جهوەر.

**جهێ** (باک.): جێگا، جێ، (باک.) جە. جودا. ــ کرن: جوداکردن. ــ بوون: جودابوون.

**جهێر** (باک.): جهار.

**جهێز** (باک.): جهاز.

**جێ** (فە.، هەورا.): جەو، جۆ، یەو، یەوی، یەڤە. دیلەڤ، جێگا، جێگە، حاست، جە، (باک.) جهێ، دەڤەر، جاگەر، شوێنێکە چتی تێدا دابنرێ یا بۆ دانیشتنی دەست بدا. لە ــ بردن: لەگەبردن. لە ــ چوون: (هەورا.) جەمابوون، لەخەرتەکچوون، لەگەچوون، دەرچوون، بە ــ: (گەر.) وەجێ، بەجێهێنان: وەجێهێنان. بێ ــ: خۆڕایی، بادی هەوایی. ــ کردن: جێگاکردنەوە، لێگیربوون. جێکرن. ــ کردنەوە: دامەزراندنی چتێک لە شوێنێک.

**جێبەجێ:** دەستبەجێ، کوتوپڕ، کە بانگم کرد ــ هات، پیک، ــ بوون: پێکهاتن، ــ کردن: پێکهێنان.

**جێبوونەوە:** دامەزرانی چتێک لە جێگایەکیدا. گونجان و دامەزرانی یەک یا چەند گیان لەبەر و چتێک لە جێگایەکی.

**جێپێ:** پاجێ. ــ ی چاروا: جێگەپای چاروا، چاڵپا.

**جێپێ کردن:** جێپێ لێژکردن.

**جێپێ لەقبوون:** جێپێ لێژبوون.

**جێپێ لێژبوون:** جێپێ لەقبوون: جێگاو داڵدە لێ شێوان.

**جێپێ لێژکردن:** جێ پێ لەقکردن، جێگا و داڵدە لێ تێکدان.

**جێپێ هەڵگرتن:** شوێن پێهەڵگرتن بۆ چتی دزیاری وتاوانکاری.

**جێخۆشکردن:** جێگای خۆ لەشوێنێکیدا کردنەوە.

**جێخوون:** جۆخین، خەرمان.

**جێدار:** نووێنەر. ــ ی: نووێنەری.

**جێر** (باک.): جەرە، تونگەی گەورە.

**جێرک** (باک.): هێشووی چکۆلە، زەنگەتەی ترێ.

**جێریفک** (باد.): گەسک.

**جێریفکڤان** (باد.): گەسک لێدەر.

**جێرە** (کە.، باک.، ڕۆژ.): جۆخینی شەنەباکراوە، دەخل و دانێکی سووری لە (کا) پاکراوەیە، ڕەوسە، خەرمان.

**جێژن:** جەژن، زێو.

**جێژنانە:** جەژنانە، هالۆلک.

**جێژنە:** جەژن، جێژن، زێو، ــ پیرۆزەکردن: پیرۆز بایی کردن.

**جێژنەپیرۆزە:** جەژنە پیرۆزە.

**جێژنەپیرۆزێ:** پیرۆزبایی کردنی جەژن.

**جێژنەی ئازادی:** جەژن و یادی ئازاد بوونی گەلێک یا نەتەوەیەک.*

**جێژنەی سەری ساڵی:** جەژنی کۆتایی هاتنی ساڵێک و دەستپێکردنی ساڵێکی نوێ.*

**جێژنەی ڕۆژووان:** جەژنی ڕەمەزان.*

**جێژنەی قوربانی:** جەژنی گەورەی موسڵمانان.*

**جێژنەی گوڵان:** بەهار.

**جێژنەی نەورۆزێ:** بڕوانە: جەژنی نەورۆزێ.

**جێژووان:** ژووانگە.

**جێژەی** (باک.): گەڵای ووشکە، کە زستانان دەدرێ بە وولاخ و ئاژاڵان، هەڵاش، خەزەڵ.

**جێگا:** (باک.) جێ، جێگە، جهێ، تەڤگەر، یاگە، جی، جا، جاگە، چێگە، ئەوزەر، (باک.) دیلەڤ، حاسق، قاست، پاڵ، کێل، دەرڤەل، دەڤەر.

**جێگا گۆڕکێ**: جێگۆڕی، شووێن گۆڕین.

**جێگایی**: خۆجێیی.

**جێگە**: جێ، جێگا، شووێن و تەخت و پێخەف، پایە، پلە، جاه، باتی، لەباتی، جیات، لەجیاتی.

**جێگەئاووردن**: بەجێهێنان.

**جێگەباز**: (؟)

**جێگەبەجێگە** (ئەردە.): جێبە جێ.

**جێگەبەجێگەکردن**: جێبەجێکردن.

**جێگەپای چاروا** (ئەردە.): جێپێی چاروا، چاڵپا.

**جێگەی خەرمان**: خەرمانگا، خەرمانگە.

**جێگەخۆشکردن**: مەبەس لەوەیە، کەیەکێک بیەوێ لە شووێنێکیدا بمێنێتەوە دەڵێ جێگەی خۆم خۆشکردووە.

**جێگەداخ**: داخگە، داخگا.

**جێگەدار**: جێنشین، جێگەنشین، جادار. ـــ ی: جێنشینی، جێگەنشینی، جاداری.

**جێگەی دانیشتن**: نیشتمان، زێد.

**جێ گەرمکردن**: جێگاگەرمکردن، جێگاخۆشکردن، مەبەس لە شووێنگرتن و دۆزینەوەیە.

**جێگەزەخم**: زەخمگا.

**جێگەشەم**: شەمگا، شەمگە.

**جێگەکردنەوە**: جێکردنەوە، جێدان.

**جێگەگرتن**: جێگرتن.

**جێگەگۆڕکێ**: جێگۆڕی، جێ گۆڕکێ.

**جێگەماگ** (ئەردە.): جێماوە، کەلەپوور، جێماگ.

**جێگەمان**: جێمان، دوامان، دواکەوتن، دواکەفتن.

**جێگەماو**: جێماو، کەل و پەل و چتمەک.

**جێگەمەرەزە**: چەڵتووکجاڕ، مەرەزگا.

**جێگەنەمام**: نەمامگە.

**جێگەنشین**: جێنشین، جێگەدار، جادار. ـ ی: جێنشینی.

**جێگەنوێژ**: نوێژگە، مزگەوت.

جێگەنوێژ

**جێگەهاووردن**: بەجێهێنان.

**جێگەهەنگوورشیلان**: دۆڵە، دووڵیان.

**جێگەهێشتن**: بەجێهێشتن، ڕەتبوون، لە ڕێگا و ئیتر.

**جێگەی**: لەجیاتی، لەباتی، جێگەی ئاوخواردنەوە.

**جێگەی سەووزبوون**: کێڵگە.

**جێگەی شەتڵ**: باخڵە، تۆمەدانە، شەتڵجار.

**جێگر**: جاگر، جێنشین، جێگیر، وەرت، شووێنگر، جێگیر، وێرت.

**جێگرتوو**: بنەگرتوو، دامەزراو.

**جێگربوون**: چەسپان.

**جێگرتن**: دامەزران، چەسپانی چتێک لە شووێنێکی. ئەم پیاوەتیەی، کە کردت جێی گرت.

**جێگرتنەوە**: شووێنی یەکێکی زیندوو یا مردوو گرتنەوە.

**جێگری**: جێگیری، جێنشینی.

**جێگیر**: جاگر، جێنشین، وەرت، وێرت، شووێنگر، چتێکە شووێنی خۆی گرتبێ.

**جێگیربوون**: کوورس بەستن، سەقامگیربوون، دامەزران.

**جێگیرکردن**: دامەزراندن.

**جێگیری**: جێگری، جاگری.

**جێل** (باک.): حیزران.

**جێڵ** (ئەردە.): جحێڵ.

**جێلانەجووقە** (شار.): هەڵادۆشە.

**جێمان**: بەجێمان.

**جێماو**: بەجێماو.

**جێمک** (ڕەوا.): دووانە، جمک.

**جێندک** (باک.): لاجانک.

**جێنشین**: (باک.) بنەدار، بندار، کەسێکە لە جێگای یەکێکی تر دانیشێ.

**جێنشینی**: (باک.) بنەداری، بنداری.

**جێنووک** (خۆ.، ڕەوا.، هەو.): لاجانک.

**جێنیش**: جێگر، جێگیر، وەرت، وەرت و پرت، منداڵ.

**جێنیشی**: جێگری، جێگیری.

**جێنیک** (خۆ.، هەورا.، هەو.): لاجانک.

**جێو**: بڕوانە: جێوی.

**جێوە** (لو.): دەراو.

**جێوەرەزەن** (موک.): ئەو شووێنەیە، کە میوەی لە سەر ووشک دەکرێتەوە.

**جێوەلەک** (باک.): هەرزە، ئاوارە، بەدبەخت، فەلەکزەدە.

**جێوەک**: (باک، زا.): دووانە، جمک، جێمک.

**جێووک** (باک.): وێکچوو، وەیەکچوو.

**جێوی** (باک.): دووانە، جێووک، جمک. وێکچوو، وەیەکچوو، لێککردن.

**جێهێشتن**: بەجێهێشتن، جێگە هێشتن.

**جێی**: لەبەرانبەر، لەجیاتی، لەجێگای، لەبری.

**جێی لێنەبێ**: دوورلە ڕووی ئێوە، پەرژینی قایم بێ، حەددی نەبێ.

**جی** (فە.، زا.، ئەردە.): جێگا، بنەڕەت. ـ بوون: (زا.) جوودابوونەوە.

**جیا** (کە.): جودا، جوایەز، وێکنەچوو. تاک، بۆ دوو یا چەند کەس و گیانلەبەر و چتان بەکاردەبرێ، کەپێکنەچن: ئەوزەوییانەجیان، ئەو ئاغایانەجیان، ئەو ووڵاخانەجیان. (باک.) جێگا.

**جیائەستەی** (هەورا.): بەجێهێشتن.

**جیائی**: تاکی، جودایی.

**جیابوونەوە**: جوویبوونەوە.

**جیات**: بات، بری، لەشوێتنی. لە ــ ی : لەبری، لەباتی.

**جیاز**: (باک.) نەخت، جهاز، جهێز، قەڵەن، رەهەڵ. ــ ی ووشتری: کورتانی ووشتری.

**جیازی**: ناومالّ و کەل و پەلێکە، کە لەگەڵ بووکێی بنێرنە مالّی زاوا.

**جیازی بووکان**: جیازی وەویان.

**جیازی وەیوی**: جیازی بووکان.

**جیاکار**: جیاواز.

**جیاکاری**: جوداکاری، جیاوازی. ــ کردن: جویّ کردنەوە.

**جیاکردنەوە**: جوویّ کردنەوە.

**جیاواز**: جوایەز، جودا، جیا، سەربەخۆ.

**جیاوازی**: جودایی، جیایی، جوایەزی، لەنێوانی دوو یا چەند گیان لەبەر و چتاندا.

**جیاوەبوون**: جوویّ بوونەوە.

**جیاوەکردن**: جوداکردن.

**جیاوەنەوون**: جوویّ نەبوونەوە، تاکەوەنەوون، لکیان، چەسپان.

**جیایی** (هەورا.): جودایی، جیاوازی، جوایەزی.

**جیەمان**: جێگەمان، بەجێمان.

**جیبان**: جیوان.

**جیبرک** (باد.): مڵە.

**جیجک**: جووچک، جووچکە.

**جیجکان**: لاقان، لەسەر ــ دانیشتن: واتە لە سەرپێیان هەڵتروشکان.

**جیجک**: جووجەڵە.

**جیر**: جیل، (لاستیک).

**جیڕ**: جڕ، چتی بەکێش و بەهێز.

**جیران**: دراوسێ.

**جیڕاندن**: جیڕەکردن.

**جیڕە**: دەنگی مارو دەرکەو ئیتر، چیڕەچیڕ.

**جیرە**: مووچە، ڕۆژانە، مانگانە.

**جیڕجیڕۆک**: گیایەکی بەهاری گەڵاپانە وەکوو تووتن دەکرێتە گزرە بۆ ئاژاڵان لە زستانێدا.

**جیڕەجیڕ**: چیڕەوجیڕەی یەک لە دووی یەکی مارو دەرکە و چتی ترە بێ پسانەوە، جیڕەهۆڕ، جیڕەجیڕی زۆر.

**جیرەخۆر**: مووچەخۆر. ــ ی: مووچەخۆری.

**جیڕبوونەوە** (ئەردە.): ڕیچبوونەوە، بەهێزبوونی شت.

**جیرۆ** : ئاژاڵی کەمشیر یا لە دۆشینیدا درەنگ بدۆشرێ.

**جیری** (باک.): جێری.

**جیز**: خەرمانی سوور و پاکراو.

**جیزە** (ئەردە.): گیزە.

**جیزەجیز** (ئەردە.): گیزەگیز.

**جیفرک**: لووشکە، لەقە.

**جیق**: ڕیخۆڵەو جەرگ و ناوو ناوزگ و جیقنە، ــ دەرهێنان: فلیقاندنەوە، پەلاختن، ئەفچکاندن، پەلچقاندن، پرچقاندن. (خۆ.) جیقنە، ڕیقنە.

**جیقاندن**: جیقەکردن.

**جیقانن**: جیقەکردن، جیقاندن.

**جیقە**: جوورە دەنگێکە لە هەندێ کەس پەیدا دەبێ لە کاتێکیدا کە لە ناودەستێدا پیسایی بکا، جرووکە، دەنگی خوێندنی پەلەوور، جیکە، فیقە، زیقە.

**جیقەتۆرە**: چیقەتۆرە، چیکڵدانە.

**جیقەجیق**: جیق و هۆڕ، جیقەجیقی زۆر.

**جیقەدانە**: جیقەتۆرە، چیکڵدانە.

**جیقەنە**: ڕیقنە.

**جیقەدەرهاتن**: هەناو دەرهاتن لە ئەنجامی پێ لێ نان یا کەوتنە بەر گرانایی.

**جیقەدەرهێنان**: هەناو دەرهێنان لە ئەنجامی خستنە بەر قورساییەوە.

**جیقلدانە**: چیکڵدانە، زیقەتۆرە، جقڵدانە، (ئەردە.) چلەدانە.

**جیقن**: گیان لەبەری لەڕو بێ تین، کەسێکە بجیقێنێ.

**جیقنە**: ــ ی پەلەوەران، ڕیقنە، (ئەردە.) جیق، ڕیپۆقی چاو. مەردوەمی جیقن.

**جیک**: پاژنە.

**جیکاندن**: جیکەکردن.

**جیکانن**: جیکەکردن.

**جیکە**: زریوە، جریکە، جریوە، جووقە: ــ ی چۆلەکەو بێچووە باڵنداں، جووکە، جرووکە، جریکە، جیقە.

**جیکەبڕین**: جووکە بڕین، خەفەکردن.

**جیکەجیکە**: چتێکە لە قوڕ و قاقەزی دروست دەکەن بۆ منداڵان دەنگی لێوەدێت

**جیکەجیک**: دەنگی چۆلەکە و جووجیلە و ئیترە. جوقەجووق، زریوە زریو، جریکەجریک، زیقەزیق، جیقەجیق.

**جیکەدان** (لو.): چیکڵدانە.

**جیکەنە**: چیکنە، چتێکە پەمۆ دانەی پێ لە پەمۆی جوویّ دەکرێتەوە، چەرخێکە، خەرەک. ــ کردن، چیکەنەکردن. بێوەفرە، نەسرەو، نائارام.

**جیکڵدانە**: چیکڵدانە.

**جیکەنەکریاگ**: چیکەنەکراوە.

**جیکنە**: خەرەک.

**جیکنەکردن**: ڕیقنەکردنی پەڕەوەر.

**جیکنەکریاگ**: جیکەنەکراوە.

**جیقنەسپیلکە** (موک.): ڕیقنەسپیلکە، لۆغان، نێودەمی پەڕەووران بەتایبەتی هی ماڵەکی جووورە زیپکەیەکی دەردەکات سپین و چارەی دژوارە، پیوازی پیشاویا سالیسیلات یەک لە ٨ یا پەرمەنگەنات ٢ لە (١٠٠٠) ی دەدەنێ.

**جیل:** جیر، لاستیک: چتێکە تایەی ئۆتۆمۆبیل و پاپۆش و خەتکوژێنەوەو هەزاران چتی تری لێ دروست دەکەن. بنەجەکە، رەچەڵەک، (نسل)، رەگەز.

**جیلەبڕین:** جۆگەی تازە نۆکەن.

**جیلوە:** زاخاو، نەشوونما، (عیشوە). پرشەنگ، پرشنگ، رووناکی خۆر. ـــ گەر: عیشوەگەر، سەرگران. ـــ ی: عیشوەگەری، سەرگرانی. ناوی یەکێکە لە دوو پەرتووکە ئاسمانییەکانی برا یەزیدییە کوردەکانمان گۆیا شێخ ئادی کوڕی عەدیی مسافر نووسیویەتی، کە خەڵکی هەکاری بووە.

**جینار** (باک.): دەراوسێ.

**جینجیناڕۆک** (ئاک.): گوڵی هەناری.

**جینجک:** پل؛ ـــ یک گۆشت: پلێک گۆشت.

**جینچکان:** چینچکان.

**جینک:** لاجانگ.

**جینگەنە:** سەرسەری، هیچ و پووچ، پەتیارە، وازی وازی، دەمدەمی، (باک.) جەنگەنە، جینگز.

**جینگز:** جینگەنە.

**جینگڵ:** گینگڵ، گینگوڵ. ـــ خواردن: گینگڵ خواردن. ـــ دان: گینگڵ دان.

**جینگیز:** جینگەنە.

**جیوار:** بار.

**جیوان** (ئەردە.): جیبان، نوێن، پێخەف.

**جیوە** (زەن.): مۆرانە. زێوی زیندوو، زیوە، دەرمانێکی شلی جوولەجووڵکەرو بزۆزە بۆ گەلێ چتان بەکاردەبرێت. جەوی داروەدرەخت و گیایان، خیچ، گەوون، شۆکی داری، (هەورا.) هەنگوژاوی، جەوسق. جریوە.

**جیوەجیو:** جریوەجریوی جوجیلان و مشکانە و چۆلەکە و ئیتر.

**جیهان:** گیتی، شووێنی ژیان و زیندەگانی خۆش و پڕ ئاسوودەیی و کامەرانی، ئەو شووێنە پان و بەرینەیە، کە هەموو جوورە گیان لەبەرێکی تێدا دەژی و کاروانی زیندەگانی تێدا هاتووچۆ دەکات.

**جیهانگر:** جیهانگیر، گێتی گر، نێوی نێرینانە.

**جیهانگرتن:** گێتی گرتن.

**جیهانگیر:** جیهانگر، گێتیگر، بۆ شاهەنشایان و هەوریش بەکاردەبرێ، نێوی نێرینانە. ـــ ی: گێتی گیری، گێتی گرتن.

**جیپۆک:** دووانە، جمک.

# چ

**چ:** تیپێکی ئابێی کوردییە. چت. (هەورا.) ش وەکوو منیچ: منیش.

مرازی پرسیارە: چت دەوێ، چی، چەدەکەی؟ بۆ مرۆڤ نەبێ بۆ هەموو چتێک بەکار دەبرێ. نا، نەء، هێ، هە. یەکسان، بێ جیاوازی، مرۆڤ دەبێ نیشتمان پەرستبێ سا ـــ نێربێ، یان ـــ مێ. زۆر، چەند، ئەو گوڵزارە ـــ خۆشە: زۆر خۆشە. کەچی، هیچ، چوومە قوتابخانەو چ لەوێ بووی واتە، کە چی لەوێ نەبوو. (رۆژ.) چی؟، چە؟، (موک.) نا، نە، مرازی رێنەدانە، نانی ناخۆی؟، چ، نەء، نا، مرازی گچکەکردنەوەیە و بەدوواییی ناوانەوە دەنووسێ: باخچە، کولیچە، دەریاچە.

**چێ:** چ، نا، نەء، هێ، هەء.

**چا:** چاک، باش، قەنج، خاس، لەوشەی (چاک) کورتکراوەتەوە. چایی، چای لێنراو و ئامادەکراو، کەبە ئیستیکان بە تاڵی و شیرینی دەخورێتەوە، چای. تۆچای ووشک. (هەورا.) لەوێ، لەوێندەرێ، بۆدوورە، (هەورا.) چاگە. (ئەردە.) چالاو، بیر، چاوانە، تیرەچا. (باک.) لافاو، سێلاو.

**چابک** (ئەردە.): چابووک.

**چابۆر:** چوواربۆر: (وو ،،).

**چابوک:** چابک، ئازا، توندوتۆڵ، زرنگ، (ئەردە.) قۆچاخ، سۆک.

**چابوکی:** توندوتۆڵی، ئازایی.

**چابوون:** چاکبوون. چێ بوون.

**چاکردن:** چاککردن، دروستکردن، ئەسپ سوواری، ماینکردن.

**چاکردنەوە:** بیراز، (اصلاح).

**چاپ:** نووسینێکە بە هۆی پیت و ماکینەی چاپخانانەوە سەردەگرێت، ـــ بوون: بەچاپگەشتن، ـــ کردن: بەچاپگەیاندن، (وا.) پێوانەییێکە چتی پێ دەپێورێت، دوو ـــ: عەلبەیەکە. درۆو دەلەسە، شاش و شووت ناراستی. (ئەردە.) شەقڵ.

(ئەردە.) شەقڵ.

**چاپارزەن:** چاپاڵێو، چاپارزن.

**چاپارزن:** چاپاڵێو.

**چاپاڵێو:** چاپارزن، چاپارزەن، کەوگیری چای، پارزۆنگ، کەوگیرە.

**چاپان** (باک.): ئەندازە، بارست، تیەن. خام، جاو، ژاپوون.

**چاپەز:** چادان، چایدان، قۆری، لەمس یا لە فافۆن دروستدەکرێ بۆ چا تێدا لێنان. چایچی.

چاپەز

**چاپەزی:** پیشەی چایچێتی.

**چاپەکان:** چاپەمەنی.

**چاپەمەنی:** چاپکراوان.

**چاپباز** (ئەردە.): فێڵباز، درۆزن، دورگە. ـــ ی: فێڵبازی، درۆزنی.

**چاپخانە:** شووێنێکە مەکینەو پیتی چاپی تێدا دامەزرابێ، چاپگە، مەزرەکە، کە هەمووجوورە قاقەزو پەرتووکێکی پێ چاپ دەکرێ. ـــ ی کوردستان: مەزرەکەی کوردستان.

**چاپک:** چاپووک، چالاک. (باک.) گچکەی(چاپ)ە، پێوانەییێکی گچکەیە.

**چاپکار:** چاپگەر، چاپکەر، فێڵباز. ـــ ی: چاپگەری، چاپکەری، فێڵبازی.

**چاپکە:** (باک.): دەفرێکە جارجارە ماستی تێدا هەوێن دەکەن.

**چاپکەر:** چاپکار، چاپگەر، کەسێکە بە چاپ چت بنووسێ، فێڵباز.

**چاپکراو:** لە چاپدراو.

**چاپکردن:** لەمەزرەکەدان، قاقەزو ئیتر بە چاپگەیاندن، درۆوەدە لەسە هەڵبەستن. چاپلێدان، چاپکرن.

**چاپکرن:** چاپکردن.

**چاپگە:** چاپخانە، مەزرەکە.

**چاپگەر** (هەورا.): کەسێکە خەریکی پیشەی چاپکردنێ بێت، چاپکار، چاپگەر.

**چاپگەری:** مەزرەکەوانی.

چاپلوس: کلکەسووتەکار، پێرامووس، مەترەباز.

**چاپلووسی:** کلکەسووتە، زمان لووسی، مەرایی، پێرامووسی، ـــ کردن: نانی گەفی کرن.

**چاپلێدان:** لە چاپ دان، چاپکردن.*

**چاپلێدەر:** کەسێکە، کە شتێک لە چاپ دەدا.*

**چاپنڤیس:** (باک.) چاپنووس.

**چاپنڤیسی:** (باک.) چاپنووسی.

**چاپنووس:** (باک.) چاپنڤیس. ـــ ی: چاپنڤیسی.

**چاپ و چووپ** (ئەردە.): فرووفێڵ، فرت وفێڵ، چاپ و گووپ، درۆو دەلەسە، بردنی چتی ئەم و ئەو بە ناخونەک.

**چاپوک:** چاپک، توندوتۆڵ، ئازا، چوست، ووریا، ووشیار.

**چاپوکدەست**، دەست سووک، تەڕدەست. ـــ ی: دەست سووکی، تەڕدەستی.

**چاپوکروو:** خۆشروو.

**چاپوکرووی:** خۆشرووی.

**چاپوکسووار:** سووارچاک. ـــ ی: سووارچاکی.

**چاپوکی:** تەڕدەستی، ئازایی، بەپەلە.

**چاپ و گووپ:** فرت و فێڵ، چاپووچووپ، بردنی چتی ئەم و ئەو بەناخونەک.

**چات** (باک.): گەورە، گوشاد: بارام دەفـــە، واتە بارام دەمی گەورە و گوشادە. (باک.) نیمتەنە (لەلۆکەیە). (زا.) پەڕۆ.

**چاتەڕێ:** (باک.): ڕێگا یا شووێنێکە چەند لکێکی لێ جووێ بێتەوە.

**چاتر** (باک.): گەورەو فراوان: بارام دەڤـــە واتە بارام دەمی زل وفراوانە. باشتر، خاستر، قنجتر، قەنجتر، چاکتر، (باک.) چێتر.

**چاترین:** باشترین، خاسترین، قنجترین، چاکترین.

**چاتکردن** (ڕۆژ.): ماین لە ئەسپ چاکردن. دووتایان، بەدروون کردنەتێر.

**چاتکێش** (باک.): پەڕۆیەکە فرن یا تۆپی پێ خاوێن دەکەنەوە، ئاسنێکی درێژو باریکە پەڕۆی پێرادەکێشرێ بە ناو لوولەی تفەنگ و چتی ترەوە بۆ پاککردنەوە.

**چاتکێشی:** کاری لوولەی تفەنگ خاوێن کردنەوە.*

**چاتمە** (ڕۆژ.): جەوال، (ئەردە.) پاسەوان، قەرەووڵ، کێشکچی.

**چاتۆڵ:** خێوەتی گچکەیە. داهۆڵ، چاتۆڵە.

**چاتۆڵە:** دەواری تەنکی بەهار و هاوینانە.

**چاچەقولێ:** چێشتە قولێی مندالانە.

**چاچک:** جاجک، جاجکە، بنێشت.

**چاچۆڵ** (باک.): جادوو.

**چاچۆڵە** (ئەردە.): تەشقەڵە، شڵتاخ، بەمبوول، دەبە.

**چاچۆڵەباز:** جادووباز، تەشقەڵەباز، شڵتاخباز، دەبەباز، چاپباز. ـــ ی (باک.) جادووگەری، تەشقەڵەبازی، شڵتاخبازی.

**چاچۆڵگەر:** تەشقەڵەباز. ـــ ی: تەشقەڵەبازی.*

**چاچی:** چایچی، چاییچی.

**چاخ:** دەم، تاو، حەل، هەل، (باک.) پێل، چاخک، (ڕەوا.) بێن، (هەورا.) کات، لە چاخی لاوێدا: لە هەرەتی لاوێدا. (هەورا.) قەڵەو ،ئاژاڵی قەڵەو، گۆشتن چتی سازو لەبار: کاتژمێرەکەم سازە(چاخە)، دەماخی ساخە، قەواڵە، (چەک)، بنچاخ، (هەورا.) چاک، باش.

**چاخان** (ئەردە.): درۆ و دەلەسە و فیشاڵ، خۆهەڵکێشان.

**چاخانە:** چایخانە، قاوەخانە، شووێنێکە چای لێنراوی تێدا بفرۆشرێ.

**چاخانەچی:** خاوەن چایخانە.

**چاخانەچێتی:** پیشەی چاخانەچی.

**چاخانچی** (ئەردە.): درۆزن، دەلەسەباز.

**چاخان و پاخان:** درۆ و دەلەسە، خۆهەڵکێشان.

**چاخەوکردن** (ئەردە.): دابەستنی ئاژاڵ بۆ قەڵەو بوونی.

**چاخچاخ:** دەمدەم، جارجار.

**چاخک** (باک.): کات، چاخ، دەم.

**چاخکردن** (ئەردە.): سازکردنی چت، دروستکردن، ئامادەکردن.

**چاخمە:** ئاڵقەیێکە دەخرێتە ناو کونی قایشییەوە تا هەڵنە قەڵشێ.

**چاخووە** (باک.): کێرد، چەقۆ، کارد.

**چاخوچڵ** (ئەردە.): خانومان، گۆشتن، بەتەنومەن، بۆ ئافرەت.

**چاخی** (هەورا.): قەڵەوی.

چاخووە

**چادان:** چاپێدان، چایدان، قۆری، چاپەز، چاپیەز.

**چادەر:** چایدەر، چایچی، چاپەز، چاپیەز، قاوەچی.

**چادەری:** کۆن، خێوەت، (باک.) تئۆک.

**چادر:** جوورە دەوارێکە لە لۆکەی دروستدەکرێ و زۆر جاران سپییە، ڕەشماڵ و خێوەت لە خوری و تووک دروست دەکرێن.

چادر

**چادرپێچانەوە:** چادر هەڵگرتن، یا گواستنەوە.

**چادرک** (باک.): پێشگیرە، بەرهەڵبێنە.

**چادرگا:** شووێنێکە خێوەتی زۆر تێدا هەڵدرابێ، خێوەتگا، هۆبە.

**چادرنشین:** کۆچەر، چۆڵگەرد، چۆڵنشین.

**چادرنشینی:** کۆچەری، چۆڵگەردی، چۆڵنشینی.

**چادرهەڵدان:** بەستن و کوڵەگە خستنە ژێر چادر، واتا ئامادەبێ بۆ دانیشتن لە ناوی دا.

**چاذێ** (هەورا.): لەوەوە، لەئەوەوە، لە بنچینەدا (جەئای) بووەو وای لێهاتووە.

**چاذیشا** (هەورا.): لەوان.

**چار** (هەو.): چووار، ٤، (هەو.، موک.) چارە، مەرێکی لەش سپی خاڵێکی رەشی یا خەتێکی درێژو رەشی بە نێو چاودا هاتبێ، (جا.، هەورا.): مالاتێکە نێو چاوان یا رووی سپی بێ و دەورەی رووی رەشبێ، قشان، بەش، مەرێکە گوێی سپی بێ، (باک.) پەردە، دەسرەی بووکییە، دەسماڵ وەوی، کراسی کچێنی.

**چاران:** تەنها، چووار.

**چارانچەقیلە** (بابا.): گولاڵەسوورە، چارە چەقیلە، گوڵەمەشقانە، گوڵێکی بەهاری جووانە.

**چارە:** تەگبیر، راوێژ، بیرورا. رەنگ وروو، دیمەن، دیدار، روخسار، دیم، ماد، پەیکەر، جەفەر، رەنگ و روخسار، هۆرمز ـــ یێکی دزێوی هەیە. چارەسەر، باشار، یاریکاری، دۆزینەوەی رێگای رزگاری، دەرەتان، رایی کردن. ـــ کردن: چارەسەرو باشارکردن، دەرەتان دۆزینەوە، دەرمان، چارکردن، بێ ـــ: پەرێشان، رووت ورەجاڵ. بەخت. ـــ رەش: بەختڕەش. ژن و شوویی، مارەکردن، تێکەڵی، هاوسەری. بنی کچان، خووێنی کچان. باشار، دەرقەت، تیمار، ـــ ی نەخۆشی و برینان: تیمار.

**چارەپۆش:** رووپۆش. ـــ ی: رووپۆشی.

**چارەپیس:** ناشیرین، دزێو، بەدرەفتار، کرێت. *

**چارەترش:** مۆن، گرژ. ـــ ی: مۆنی، گرژی.

**چارەجۆ:** راوێژیار. ـــ یی: راوێژیاری.

**چارەچەقیلە** (سەق.): گولاڵەسوورە، چاران چوقیلە.

**چارەدژ:** گرژ، مۆن. ـــ ی: گرژی، مۆنی.

**چارەرەش:** بەدبەخت، بەختڕەش، کوڵۆڵ، (رۆژ.) بێبەخت، چارەسپی، رۆژرەش، بەتار، بوورژما، (باک.) بۆژە، بوورژمان، بۆشمان، خاکەسار، خاکبەسەر، خۆڵبەسەر. ـــ ی: بەدبەختی، خاکەساری، شەلشی.

**چارەساز:** چارەکار، ـــ ی: چارەکاری.

**چارەسەر:** رێگای رزگاری، چارە دۆزینەوە لە کارەساتێک.

**چارەسەری:** ـــ برینان: تیمارکردن.

**چارەسیاو** (هەورا.): چارەرەش. ـــ ی: چارە رەشی.

**چارەشڵ:** سوورهەول، سوورو فش، دەم و چاو سووری ناشیرین. ـــ ی: سوورهەولی، سووروفشی.

**چارەک:** چووارایەک، چارێک.

**چارەکار:** کارساز، چارەساز. ـــ ی: کارسازی، چارەسازی.

**چارەکە:** چارۆکە، چارۆگە، چارک، کۆڵوانە.

**چارەکردن:** چارەسەرکردن، باشارکردن، دۆزینەوەی دەرەتان، دەرمانکردن.

**چارەگ:** چووارایەک، چاریەک، چارێگ.

**چارەگا** (بار.، شن.): حەوتەوانان.

**چارەگەبوورزینە** (کۆ.): کۆڵوانە.

**چارەگران:** چت یا گیان لەبەری ئێسک قورس.

**چارەگرانی:** ناشیرینی، ئێسک قورسی.

**چارەم** (هەو.): چووارەم.

**چارەمین** (هەو.): چووارەمین.

**چارەنووس:** بەخت، سەرنفشت، نێوچاوانی مرۆڤ بە چاکی یا خراپی، هەرچێتێکی بەسەرم بێ ـــ ی خۆمە و بەس. بەخت و هات.

چارەوا

**چارەوا:** چارەوێ، وولاخی بەرزە، دەوار، پێڕۆ، ماین و ئەسپ وگوێدرێژ و ئێستر.

**چاربەری** (باک.): بزنێکی چووار ساڵانەیە.

**چاربەش** (باک.): چووار بەش.

**چاربێستان** (باک.): چووار بێستان، کەشوتی و کالەک و ترێزوو و هاروێ تێدا دەچینرێ.

**چارپا:** چارپایە، چەرپا، (رۆژ.) چووارپێ، چارپێ.

**چارپانی:** (باک.) جوورە هەڵپەرینێکی کوردیە.

**چارپایە:** چتێکە لە سەر چووار پێیان راوەستی وەکوو: تەخت، مێز، قەرەوێڵەو ئیتر، تەختی نوستنێ.

**چارپێ** (باک.): چووارپێ، مەبەس لە ئاژاڵ و وولاخی بەرزە و رەشە وولاخ و گوێدرێژانە.

چارپایە

**چارپینە:** (باک.) جوورە هەڵپەرینێکە. (باک.) چووارپینە، ناپایەدار، بێفریشک.

**چارپینەیی:** بێ پایەیی، بێفریشکی.

**چارتا** (باک.): چووارتا، چووارقات، ئەمزێ مافێ خووە چارتا بستێنم: ئەمن مافی خۆم چووار قات دەستێنم.

**چارتاق:** چووارقات، چووارهەندە.

**چارتێکەڵی:** (هەورا.) چووارمەشقی، چووارمێزەکی، چووارمێردەکی، جوورە دانیشتنێکە.

**چارچار:** چووارچووار، تیپی پێشمەرگان چووار چووار بەرێز دەرۆیشتن.

**چارچاف** (باک.): ووشیار، چووارچاو، زرنگ.

**چارچەف** (باک.): چارشێو، چارشەف، پەردە.

**چارچەک** (باک.): پرچەک، چەکدار.

**چارچک** (باک.): چووارگۆشە. (باک.) ـــ ی: چووارگۆشەیی، شکڵی چووارچێوەیی.

**چارچم** (باک.): چووارچێوە.

**چارچووفە** (باک.): چووارچێوە.

چارچێوە

**چارچی** (باک.): چارجێ، چووارپارچە، چووار رێ.

**چارچیق** (زا.): زەوییەکە قوڕی زۆربێ.

**چارچێوە:** چووارچێوە.

**چارداخ** (موک.): خانووچکەی نێوباخانە، کەپلە، هۆڵک، (باک.) دالان، هەیوان.

**چاردار** (زا.): دارتەرم، چووردار وەکوو تـابووت وایـە برینـدار و کوژراوی خۆیانی لـە سەر بە گوریسی دەبەستن.

**چاردە:** چوواردە (١٤).

**چاردۆر** (باک.): چوواردەورە.

**چاری:** چارەک.

**چارڕێیان:** چووار ڕێیان.

**چارشا** (خۆ.): داهاتوو، ترسشکاو، ئازا.

**چارشانە:** مرۆی زەلام و چووارشانە.

**چارشانین** (فە.): فێربوون.

**چارشایی:** پارەیەکی ئێرانییە.

**چارشەب** (زا.): سەرپێچ.

**چارشەڤ** (باک.): پارچە و پەردەیەکـە بەسـەر تـەختی خـەوێدا دەدرێ، چارچەڤ.

**چارشەم:** چووارشەمە.

**چارشەمە:** چووارشەمە.

**چارشەمەسووران:** چووارشەمەسووران.

**چارشەمب** (باک.): چووارشەمە.

**چارشەمبە:** چووارشەمە.

**چارشەنب:** چووارشەمە.

**چارشەو** (ئەردە.): سەرپۆش، چارشێو.

**چارشەو پێچە:** عەبا و پێچە.

**چارشەو پێشەو** (دەر.): چارشێو.

**چارشەونووێژ:** سەرپۆشی نوێژێ.

**چارشەو یەکتەختە:** چارشێوی یەکتەختە.

**چارشێو:** (بـاک.) هـیزار، هـیزا. (کـە زەردە یـا سـوور یـا شـین بـێ) چارشەوپێشـەو، چارشـەو، چارچـەڤ، (بـاک.) کەمـەرچین، پەڕۆیـەکی گەورەو چووار گۆشەی ئاوریشمی یا سوورمەییە ژنان لە جیـاتی بـالا پۆش دەیگرنەوە.

**چارقاپ** (دزە.): بزۆز، بێتۆرە، سـاختەچی، جـوورە سـەگێکە لـە کـاتی ڕاوەستانی و هەڵترووشکانیدا لای پشتەوەی زەندی دەکەوێتە سەر زەوی، زەندەشۆڕ. بۆ مرۆیانیش بۆ توانج بەکار دەبرێت واتە وەکوو چوار پێیانە.

**چارک** (باک.): چارۆکەی ژنـان، چارۆکـەی سپی: ژن بـۆ سـووکی دەڵێـن چارکامن لە سەری تەبی. برنک، برینگ.

**چارکاسە** (باک.): چوار هێندە.

**چارکەنار** (باک.): چوارکەنار، چوواردەورە.

**چارکولۆل:** مەڕی سپی و ناوچاوان ڕەش.

**چارگ** (ڕۆژ.): برینگی ئاژاڵ برینەوە.

**چارگاڤ** (باک.): چوارناڵە: هەسپێ من چارگـاڤ دچێ: ئەسپی مـن بـە چوار ناڵە دەڕوا. (باک.) ــ ی: چوارناڵەیی.

**چارگۆشە:** چوارگۆشە، چارقۆزی.

**چارگۆشەیی:** شێوەی چوارگۆشەیی.

**چارلەپک** (باک.): چوارپەل، بچارلەپکی چوون: بەچوار پەلان ڕۆیشتن.

**چارلنگ** (باک.): تەختی نوستنییە لە دار. چوار پێ وەکوو، گا، مانگا، گامێش، کەڵ، ووشتر، کەر، ئێستر.

**چارمەدۆر** (باک.): چوارکەنار.

**چارمەشقە:** چوارمەشقی.

**چارمەکووک** (باک.): جوورە بووزووێکە.

**چارمیدۆر** (باک.): چوارگۆشە، چواردەورە.

**چارمێرکی** (باک.): ــ ڕۆنیشتن، بەچوار مێردەکی دانیشتن.

**چارنیچک** (باک.): چوارگۆشە.

**چارۆ** (بار.): چاروا.

**چاروا:** (بار.) چارڤە، پێڕۆ، چارەوا، چارەوێ، چاورە، چووارپێ، ووڵاخی بـاری، بـارگین و کـەر و ئێستـر، (مەبـەس لـە ئەسـپ و مـاین و ئێسـتر و کەرانە).

**چاوادار:** چارۆێدار، ووڵاخدار.

**چاروە:** چەقەنە، چەند کانێکە سەماکەر لە قامکیان دەکەن و چەقەنەی پێ لێدەدەن.

**چارۆخ** (باک.): وەکـو کاڵـە وایـە لـە چـەرمی گـا و گـامێش و ووشـتری دروست دەکرێ.

**چارووخ** (باک.): پاپووچە، جوورە پێڵاوێکە، بابووج.

**چارۆک** (باک.): چارۆکە.

**چارۆکـە:** (هـەورا.) کۆڵوانـە، چاریکـە، (بـاک.) چارۆگـە، چـارک، شاڵینە، پارچە چیت یا هەرتنراوێک بێ ژنان لە کۆڵی خۆیانی وەردەگرن، لە ناو شیناوەردیانیشدا چتی تێدەکەن. سەرپۆشی ئافرەتانە. مندالّدان، پزوو، پرزانگ. گیایەکە وەکوو بـامێ وایـە بـەڵام نزمـترە و گەڵایەکانیشی ووردترن، گوڵی زەرد دەگرێ ئاژاڵ باشی دەخووات.

**چارۆگە:** چارەکە.

**چاروێ:** چاروا.

**چارۆێدار:** ولاّخدار. ــ ی: ولاّخداری.

**چاری** (باک.): چارۆکە.

**چارەیەک:** چارەگ، چارێگ، چوار یەک.

**چاریچی** (باک.): بازرگانی ئاژالان، چەرچی.

**چارێز** (باک.): چوارینە.

**چارێک:** چارەک لە کات و چتی تر، چواریەک، چاریەک، چارەگ.

**چارێگ:** چارەگ، چاریەک، چارێک.

**چارێن:** چوارین.

**چارینی** (باک.): چوارلک، چوار خشتەکی.

**چارییێک:** چاریەک، چارەگ.

**چازوو** (باک.): (باک.) جازوو، جادوو، فێڵباز.

**چازووگەر** (باک.): (بـاک.) جازووگـەر، جادووگـەر. (بـاک.) ــ ی: جازووگەری، جادووگەری.

**چاژی** (هەورا.): لەوێ.

**چاشبوون**: واق وورمان، سەرسوورمان لە کارێک.

**چاشت** (هەورا.): چێشت، شێو. (ئەردە.) قاوەڵتوون (نزیک نیوەڕۆیە)، جەمێکە لە هەر چوار جەمەکان، بەنانی نیوە ڕۆیەش دەڵێن. (ڕۆژ.، سنە.) چێشتان، چێشتەنگاو.

**چاشتان**: چێشتان، چێشتەنگاو.

**چاشتەنگاو** (ڕۆژ.): چێشتەنگاو، کاتی چێشتانێ.

**چاشتخانە** (هەورا.): چێشتخانە.

**چاشتکەر** (هەورا.): چێشت لێنەر.

**چاشتن** (هەورا.): چەشتن.

**چاشتی** (هەورا.): چێشت.

**چاشتیگا** (هەورا.): چێشتەنگاو، کاتی قاوەڵتوونی.

**چاشتێنگا** (هەورا.): چێشتەنگاو، قاوەڵتوون، (ئەردە.) قاتوون، دەمی قاتوون.

**چاشتی وەشە** (هەورا.): چێشتی خۆش.

**چاشنی** (ئەردە.): تام، چێژ، مەزە. (ئەردە.) چەشنی، تریقە. (ئەردە.) تورش، ترش، ترشی. (هەورا.): شێو، چێشت.

**چاغ و بەنگ** (باک.): تەفرە، فریو. ـــ دان: تەفرەدان. ـــ کرن: تەفرەکردن.

**چاڤکەر** (زا.): مرۆڤی چاو پیس.

**چاڤ**: چاو، چەم، چاو گەلێک جوری هەیە: چاڤێ ڕەش، چاڤێ بەلەک، چاڤێ شین، چاڤێ زەر، چاڤێ مێشنی بەلاّن کوردان زۆریان بە چاوی ڕەش وبەڵەک هەڵگرتووە. (باک.) بەرچاڤ: پێشچاو، بەرچاو، سامدار، بەشانوشکۆ، بچاڤی خووەدان (باک.) وەبیرهاتنەوە. بنچاڤالمن دنێرە: ئەو تەماشای من بەخوواری دەکات، ترسا چاڤێن وان ـــ دسەرێ واندە وێ بلەبییزە: ئەوان هێندەیان ترس بوو، کەسەری خۆیان کزکردبوو، لەبەر چاڤێ خووە ڕاکرن(باک.): تاقی کردنەوە بەووردی، سەرچاڤان: بەسەرچاوان.

**چاڤا** (باک.): چلۆن، چەجوور، چۆن.

**چاڤبەرد**: تروسکەدار، بریقەدار.

**چاڤبەرگ** (باک.): چاویلکە.

**چاڤبەڵەک** (باک.): چاوبەڵەک، چاوبۆر.

**چاڤبەلۆق** (باک.): چاولەدەر، بێشێواز، بەدکردار.

**چاڤبرچی** (باک.): چاوبرسی.

**چاڤبرچیتی** (باک.): چاوبرسێتی.

**چاڤبارسەک** (باک.): تەفرەدەر، فریوباز، غەمزەوناز بۆ ئافرەت.

**چاڤپەلچی** (باک.): چاوکول، چاونێشەدار.

**چاڤپل** (باک.): چاونێشەدار، چاوکول.

**چاڤپلی** (باک.): چاونێشە، چاوکولی.

**چاڤپیس** (باک.): چاوپیس، ناکەس. (باک.) ـــ ی: چاوپیسی.

**چاڤتار**: چاو بێتین، چاوکز.

**چاڤتاری** (باک.): چاوبێتین.

**چاڤتەنگ** (باک.): ڕژد، بەرچاوتەنگ، (باک.) چکووس.

**چاڤتەنگی** (باک.): ڕژدی، بەرچاوتەنگی.

**چاڤترسەنۆک** (باک.): دلسارد، تێکشکاو. (باک.) ـــ ی: دلساردی، تێکشکاوی.

**چاڤتێر** (باک.): چاوتێر. ـــ ی: چاوتێری.

**چاڤدێر** (باک.): چاودێر، تەماشاکار.

**چاڤدێران**: چاڤدێری، چاودێری.

**چاڤدێرانن** (باک.): چاودان، چاودێران.

**چاڤدێری** (باک.): تەماشاکردن.

**چاڤرەش** (باک.): چاوڕەش. ـــ ی: چاوڕەشی.

**چاڤرێ** (باک.): چاوەڕێ.

**چاڤزۆرک** (باک.): چکزین، ئەنتوپەهت.

**چاڤزێلک** (باک.): جەرکەهەلین، ناوێژە، ناشنا، پرپەرس، دەرخەر، پشکێنەر.

**چاڤسپیک** (باک.): سووسەمار.

**چاڤسۆر** (باک.): چاوسوور، پشتیوان. ـــ ی: چاوسووری، پشتیوانی، بێدادی، جەوور.

**چاڤشار** (باک.): چاوسوور. ـــ ی: چاوسووری.

**چاڤشاش** (باک.): خێل. ـــ ی: خێلی.*

**چاڤشکەست**: چاوشکاو، چاوترساو.*

**چاڤشکەستی**: ترساو، کەسێکە چاوی لەبەر دوژمنی هەڵنەیێ و لەڕاست ویدا دەست نەکاتەوە.

**چاڤشین** (باک.): گیایەکە.

**چاڤ فرە** (باک.): دلفراوان، چکووس، چوومەرد.

**چاڤ فەکری** (باک.): چاو کراوەوە، ووشیار.

**چاڤک** (باک.): چاویلکە.

**چاڤکەسپک** (باک.): چاوبۆر.

**چاڤکەسک** (باک.): چاوکەسک، چاو کەسک و بۆر.

**چاڤکتک** (باک.): چاوشینە.

**چاڤکلدایی** (باک.): چاوبەکل.

**چاڤکوور** (باک.): تازوەر، قارنان، چاوبرسی.

**چاڤکول** (باک.): چاوکول.

**چاڤکولی**: چاوکولی.*

**چاڤکەرۆک**: چاولێکەر، لاسایی کەرەوە.*

**چاڤگەرۆک** (باک.): چاوگێڕ. ـــ ی: چاوگێڕی.

**چاڤگرتی** (باک.): چاوبەستراو، گێتی کەم دیتوە، سادە، نابەڵەد.

**چاڤگرتیتی**: سادەیی، چاوبەستراوی.

**چاڤلەدەری** (باک.): چاولەدەرێ، تۆلاز.

**چاڤلێ بوون** (باک.): چاولێبوون، دیتن.

**چاڤلێدان** (باک.): چاولێخشاندن.

**چاڤلێکرن** (باک.): چاولێکردن، دیتن.

**چاڤلێگەڕاندن** (باک.): چاولێگێڕان.

**چاڤ لێ کەفتن یا پێکەفتن:** دیتن.

**چاڤێ من لڕیا تەیە** (باک.): چاوەڕێت دەکەم.

**چاڤناس** (باک.): ئەوکەسەیە، کە بەچاوخەڵکی دەناسی یا خەڵکی بە چاویانڕا دەناسێ، شارەزا، زرنگ.

**چاڤنقاندن** (باک.): چاو قووچاندن.

**چاڤنەباری** (باک.): نەکێشان، چاولە دوویی، بەرچاوتەنگی.

**چاڤنی** (باک.): چاوێنی، چاووزار، چاوی پیس، (باد.) چاڤینۆک.

**چاڤنێر** (باک.): چاودێر. ــ ی: چاودێری.

**چاڤۆک** (باک.): (باد.) بەرچاڤک.

**چاڤهوول** (باک.): خێل.

**چاڤهشین** (باک.): چاوشین.

**چاڤهولی** (باک.): خێلی.

**چاڤی** (باک.): وێچوون، لێکردن. زاری کانی و سەرچاوان.

**چاڤیچیچەکێ** (باد.): جوورە ترێیەکە.

**چاڤیگایی** (باد.): جوورە ترێیە.

**چاڤیگورگێن هاتە شکێناندن:** بەدخووی و داوێن پیسێتی تێکچوو.

**چاڤینۆک** (باک.): چاوێنی، چاووزار.

**چاڤینووک** (زا.): چاڤکەر.

**چاق** (باک.): بەشی خووارەوەی لوولاکییە. خەتێکەو جغزێکە گۆشتی لوولاکی لە ئێسکەکەی جووێ دەکاتەوە، لاق.

**چاقۆ** (باد.): چەقۆ.

**چاقیرووت** (باک.): لوولاک وبەلەک رووت، کەسێکە پۆشاکی بێشێوازی پۆشیبێ. (باک.) ــ ی: لوولاک و بەلەک رووتی، پۆشاک وباری بێشێوازی.

**چاک:** باش، خاس، رەند، رند، چا، خووە شمێر، چاخ، وەجێ، قنج، پەسند، (باک.) پاک. (هەورا.) داوێن، شاقەل، داینە. ماین لە ئەسپ ــ کردن: واتە ئەسپ خستنە سەر ماین، (رۆژ.) چاتکردن. دڕاو، هەڵدڕاو.

**چاکە:** جوامێری، باشی، چەیی، پیاوەتی، ئەرک، کردەوەی باش.

**چاکەپڕکردنەوە:** تێپەڵێنانەوە، ئەمەگداری.

**چاکەکردن:** کردەوەی باش لەگەڵ مرۆڤان. ئەسپ خستنە سەر ماین بۆ ئاووس بوونی.

**چاکەل:** تلیشی ئەملاولای داوێنی کەوا و هێندێ کالای ترە.

**چاکەڵ:** چاکەل.

**چاکبوون:** خاسبوون.

**چاکبوونەوە:** ساخ و خۆشبوونەوەی نەخۆش یا باشبوونەوەی چتێکی، کە خراپ بووبێ لە سەرەخۆ.

**چاکتر** (باک.): پاک و خاوێنتر. چاتر، باشتر، خاستر، قەنجتر، چێتر، ئەشپا، بە ــ زانین: چێترگرتن، هەڤیارکرن.

**چاکترین:** چاترین، باشترین، خاسترین، قەنجترین، چێترین، سەرپەر.

**چاکردن:** باشکردن، چاکردن. دروستکردن و لێنانی چا.

**چاکردنەوە:** دروست و ساخکردنەوە، بیرازکردن.

**چاککردن:** باشکردنی چتێک کارو فەرمانێک. مەبەس لە ئەسپ خستنە سەر ماینییە.

**چاککردنەوە:** بیراز، بەرەنیا، وەرەنیا. بیرازکردن. کاتژمێرەکەم تێکچووبوو، کەتژمێرساز چاکی کردەوە.

**چاکل** (دەر.، جا.): هێچک، چاکڵە، چەڵمە، دارێکی دووپەلی گچکەیە لە سەر گوریسێکی دەخرێ تەنگەی وڵاخی بارکراوی پێ قایمدەکرێ.

**چاکڵە:** چاتۆڵ و خانووێکی گچکەیە لە نێو باخ و باخچاندا، چاکل، چاتۆڵ، قۆخ، کۆخ.

**چاکناس:** ئەوکەسەیە کار یا مرۆ یا چتی چاک دەناسێ، واتا شارەزایە.

چاکووچ

**چاکووچ:** چەکووچ.

**چاکوچۆنی:** هەواڵپرسی.

**چاکوخۆشی:** خۆشی و بێشی.

**چاکهێنان:** دوورجاران پشمین، جەخت.

**چاکی:** باشی، خاسی، قنجی، قەنجی.

**چاکێتی:** باشێتی، خاسێتی.

**چاگە** (هەورا.): لەوێ بۆ دوورە، (هەورا.) چا.

**چال** (باک.): بزنی سەرسپی. (باد.) جەواڵ.

**چاڵ:** کۆرتک، قۆرت، قووڵکە، (هەورا.) چاڵێ، جێگای نزم و نەوی لە زەویدا، ــ ی دەغل و بەفرو ئاووێتر. (باک.) ئەسپ ومایینی بەش (نێوچاوان سپی). قووڵ.

**چالاخ** (ئەردە.): هار، هەرزە.

**چالاخی:** چەپۆکانی ئەسپ، هاروهاجی.

**چالاف** (زا.): سەرشۆرکە. (باک.) کەنار و لێواری دەریایە.

**چالاک:** نێوی پیاوانە. چەلەنگ، شاتر، توندو تۆڵ، بزەرب، گورج و گۆڵ، بەدەست وبرد، چاپک، سڤک، کرژ، چالاخ، قۆچاخ.

**چالاکی:** زەرپ، توندوتۆڵی، چوستی، تەتەری، دەستوبردی.

**چالان:** قولکسازی، چاڵسازی.

**چالاو:** بیر، دەڤی، بیری ئاوێ، گۆل، گۆلاو، ئەستێل. (زرا.، دزە.) سسووالەتێکە ئاوی تێدا دەدرێت بە مریشک و سەگان، (کە.) چالاوێن.

**چالاوی** (هەورا.): بیر، چالاو.

**چالایی:** قوولایی، چالی.

**چاڵە** (فە.): دۆڵ هی گەنم و ساوار تێدا کوتانییە.

**چاڵە بەفر:** چاڵێکی قووڵە سا گچکە یا گەورە بێ زستانان یا لەسەرەتای بەهاریدا پڕی دەکەن لە بەفر و خوێی زۆر بسەردا دەکەن و بەکا دایدەپۆشن بۆ هاوینێ.

**چاڵەپا** (باک.): چووارلەپ، چووارپەل، لسەر ــ دگەرێ: لەسەرچووار پەلان دەگەڕێ.

**چاڵەچەقیلە:** چارە چەقیلە.

**چاڵەزوخاڵ:** چاڵی ڕەژوو.

**چاڵەقووتە:** چاڵێکی گچکەی کەمێک قووڵە لە زەویدا بۆ ئاورو چتیتر.

**چاڵە قوتکە:** قولکەی چکۆڵە بۆ هەڵماتێن. مات.

**چاڵەکە:** داعبایەکی پانکەڵەی قەڵەوە و چوارپێی خرپنە و دەست وپێی کورتە و گۆشتیشی دەخورێ، (ڕۆژ.) جوو الوو.

**چاڵەوێن** (کە.): (دزە. ، زرا.) چالاو، (کە.) ـــ ی سەگی: قابێکە ئاوی تێدا دەدرێ بە سەگی.

**چاڵبێش** (باک.): ئاژاڵێکە سەر و لاقەکانی سپی بن.

**چاڵبیستان:** چواربێستان، ئەوچاڵ و دێراوانەن، کە لەنێو بێستاناندا شووتی و چتیتری تێدا دەچێنن.

**چاڵتینگ:** قووڵکەستۆ، قووڵکەی ژێرگەردنێ.

**چاڵچالان** (ئەردە.): گەمەی چاڵێن.

**چاڵچەناگە:** چاڵی چەناگە.

**چاڵداکەفتن:** چاڵبوون.

**چاڵدووز** (فە.): سووژن.

**چاڵدووینە** (ئەردە.): چاڵی دژینە، شوێنێکە کەشک یا پەنیری لە شیری ترش دەگرن.

**چاڵزنیان:** زیندان، چاڵی زیندان.

**چاڵک** (لو.): دنک. (باک.) ئەرزینێ: چاڵ و قووڵایی چەنەگەی.

**چاڵگەنم:** چاڵەگەنم، چاڵی گەنم.

**چاڵمە** (ئەردە.): کیسەی توو تنی نێرگەلەیە.

**چاڵوچۆڵ:** شوێنی بەرزونزم لە زەویدا، قولووچ قولووچ، چاڵچاڵ.

**چاڵۆک:** تەنکز.

**چاڵووک:** (هەو. ، هەورا. ، ڕەوا. ، زرا.) زی، زریسک.

**چاڵووێنک:** چاڵێکە ئاویا دۆی تێدەکرێ تا سەگ لێی بخواتەوە.

**چاڵهۆرکەن** (هەورا.): تێچێن.

**چاڵێ** (هەورا.): چاڵ.

**چاڵی:** چالایی، قووڵی، قوولایی، شوێنی نەوی ونزم.

**چاڵی بەرلووت:** قوولایی لێوی سەرەوە، قوولایی پێش کەپۆ.

**چاڵی چاو:** کاسەی چاو.

**چاڵی چەناگە:** چالایی چەنەگە.

**چاڵی گووپ:** چالایی ڕوومەت.

**چاڵێن:** جوورەگەمەیەکی مندالانەیە چاڵێکی هەڵدەکەنن گوێز یا بادام یا چتی تری تێ فڕێ دەدرێ ئەگەر جووت یا تاقی تێکەوت لایەکیان دەیباتەوە.

**چام** (باک.): جوورە دارێکی ئەستوورو بڵند، (باک.) کاج، کاژ.
جوورە چەپەرێکی سێ سووچی شوولینە بەگوریس بە ناو جۆگەدا ڕادەکێشرێ و جۆماڵی پێدەکرێ.

**چان** (ئەردە.): نیری سەرملی گاجووتانە. (باک.) زەنگ. چەپەرێکی سێ سووچە بە شووڵ تەنراوە گوریسێکی تێدەخرێت بە ناو جۆگەی ئاودا ڕادەکێشرێ بۆپاککردنەوەی ناو جۆگە لە پووشووپەلاش. چاندن، چەقاندن، نیان، (ئەردە.) وەشانن. (باک.) جۆگەو چۆمی چکۆڵە. (کە. ، کۆ.) کۆمایەک لەلکی کەبەرو کوتارو گادەمە، کەبەخڕی تێکدە پەستێورێن و وەکوو جەنجەڕ گێرەی پێدەکرێ، واتە جوورە جەنجەڕێکە لە دڕکو داڵ دروست دەکرێ بۆ گێرە و وردکردنی قرشە، ئێستاش لە کوردستانیدا هەندێک هەژار بەکاری دەبەن.

**چانە** (هەورا.): چاگە.

**چاندراو:** چێنراو، بەزەویدا چەقێنراو.

**چاندن:** شاندن، وەشاندن، (هەورا.) شانای، داچکاندن، داچکلیلاندن، داچاندن، وەنەی، فەرک، تۆڤکردن، بۆ کشتو کاڵ و بێستانان.

**چاندنگە:** نەمامگە.

**چاندنی:** زەوییێکە بۆ چاندن دەست بدات، (زا.) کشتوکاڵ، (باک.) تۆوکردن: دبێژن ئیمساڵ باران گەلەک چاندنی کریە.

چاندنگە

**چاندی** (باک.): ئەوەیە، کەچاندراوە، دبێژن تۆڤێ تەئێ چاندی چقایە؟، زەوییێکە بۆ چاندنێ دەستبدات.

**چانقۆچ** (باک.): زەنگ، زەنگی کلیسا.

**چانقۆش** (باک.): ئەوکەسەیە، کە لە دەرکان دەدا ومزگینی کات و کاتژمێری پاکێتی و ئامادەگی دەدات.

**چانکۆچ:** زەنگی کلیسایان.

**چانن** (ئەردە.): چاندن.

چانقۆچ

**چاو:** (هەورا.) چەم، دیدە، (باک.) چەهڤ، چاڤ، ئەندامی دیتنە، ـــ بەکل: چاڤکلدایی، پەلکی چاو: پێڵوو، ـــ: پارسەنگ، پارسەنگی قاب و مەنجەڵ و قەرتاڵەو ئیترە، کەبەتەرازوو دەگیرێتەوە، بزانرێ سەنگینی و قورسایی دەفرەکان چەندە. (ئەردە.) چاویلکە، چاووزار، چاوچڵە. دەنگ، ئاواز، دەنگوباو. شووڵی تەڕ، کە پێچرابێ بە چتێکییەوە. بەچاوان: لەسەرچاوان، لەسەر سەروچاوان، خووەی ڤینی، بسەرچاڤان، سەرچاڤان، بە ـــ دادانەوە: وەڕوودانەوە، مناکرن، هێنانەوەپێش چاو، بەڕوودادانەوە، ژانی ـــ، بە ـــ وەکردن: لەچاو بردن، چاوپێ هەڵنەهاتن، هەڵپەرداوتن، هەلپەرتاوتن، لەبەر ـــ خستن، لەبەر ـــ کەوتن: لێ بیزاربوون، لەبەر ـــ بردن، ـــ تێبڕین: تەماشاکردن، چاولەبەر(موک.): شەرمەزار، بەرپرسیار. چاولەدوو: ـــ بوون: ئاروەز، سەر ـــ ان: (باک.) سەرچاڤان، لە ـــ بردن: بەچاوەوەکردن، چاو پێهەڵێنان.

چاو

**چاوا** (باک.): چۆن، چلۆن، مرازی پرسیارە.

**چاوناگر** (خۆ.): دەستەچیلە.

**چاوان** (باک.): چلۆن، چۆن.

**چاوانە:** چالاو، کانیاو، سەرچاوە.

**چاوانکی** (باک.): چۆنەکی، چلۆن.

**چاوانی:** چاوێنی.

**چاوئێشان:** چاوکولبوون، زچین.

**چاوئێشانێکی ئاوبکات:** کنیست.

**چاوئێشه:** چاوکولی، (هەورا.) چەم ئێشه، (باک.) چاڤیلی، چاوێشه، بۆ ــ : زاخی سووتاوی هاڕڕاوی ئالەبێژکراو دوو مسقاڵ و سپێنەی هێلکەیەکی تێکەڵ یەکتری دەکرێن بە کەوچک یا بە شووشە دەشڵە قێنرێ تا کەف دەکا ئەوسا دووای نیشتنەوەی چەند تنۆکێک لە ئاوەکەی لە نێو چاودەکرێ و کەفە کەشی وەکوو شەڵتە لە سەر چاو دادەنرێ هەموو کفت وکۆ و ژان و ئێش و ئۆف و هەوا و ئازارێکی دەکێشێ.

**چاوئێشه:** چاو کول بوون.

**چاوئێشەدار:** چاوێکی ئێشی هەبێ.

**چاوه:** (هەورا.) دیو، ژوور، هۆده، کون، هی چتێکی بێ، (دزه.) لەگێرەکردنێدا کەمکەمە لە کۆمای نێوەڕاستێوە بخرێتە بەرپێیان بۆ کوتانێ. کانی، سەرچاوه، چاوکه، ڕووپامایی، ڕووالەت.

**چاوەچاو:** چاوەڕێ، چاوەڕووان، چاوەنووارِی، چاوگەڕاندن. ــ ی: چاوەڕێیی.

**چاوەدووا** (ئەردە.): چاولەدووا، دڵە دووا.

**چاوەخووار** (کە.): شەرمەزار.

**چاوەدێر:** یارمەتیدار، تێڕا مێن.

**چاوەدێری:** یارمەتیدان، تێڕامان.

**چاوەڕاو:** چاووڕاو، درۆو دەلەسه، دەنگ و باس، چاوڕاو، (پڕۆپاگانده).

**چاوەڕوو:** شێواز، شەرم، بێ ــ : بێشەرم،(هەو.) بەینەشه، کووکه.

**چاوەڕووان:** چاوەڕێ، چاوەنۆڕ، کەسێکه، کە هیواداری چتێکی بێ و چاوەڕێی بکات.

**چاوەڕووانی:** چاوەچاوی، چاوەڕێیی، چاوەنۆڕی.

**چاوەڕوونی:** چاوڕوونی، ــ لێکردن: چاوڕوونی لێکردن.

**چاوەڕوویی:** شەرم و حەیایی.*

**چاوەڕێ:** چاوەنۆڕ، چاوەچاو، چاوەڕووان، ڕێ پان، چاوەنووارِ، (باک.) بەندەمان، ــ بوون: (باک.) پایین.

**چاوەڕێگه:** چاوەڕێ.

**چاوەڕێیی:** بەندەمانی، (باک.) ڕێنێری، چاوەچاوی، چاوەڕووانی، چاوەنۆڕی، چاوەنووارِی، بەندەواری، نێرنێری.

**چاوەزار:** ئازارو زیانێکە، کەلە چاوی پیسەوە بەچتێک یابەکەسێکی بگات، ــ: نوشتوو یا چتێکی پیرۆزه، کە بۆ چاووزار هەڵبگیرێ.

**چاوەزرتکێ:** بڕوانه: چاوزرتکێ.

**چاوەش:** چاکبێژ، چاوێژ، خۆشوێژ، گۆرانی وێژ، چڕگەر، چریکەوێژ، قامبێژ، مەقامبێژ، دەهۆڵ و زوڕنا ژەن، شایەر، ــ: ی سووپایی: کەسێکە لەناو سووپادا بیست پێشمەرگەی بە دەستبێ. زۆربلێ، چەنەباز، چەنەسووک.

**چاوەشی:** پیشەی چاوەش.

**چاوەقووڵە** (ڕۆژ.): چاوقووڵکه، دەردی ڕشانەوه، ئازار، ئازارو ئاهۆیەکی کوژندەیە.

**چاوەنداز:** بەرچاو، دیمەن، تەماشەگه، چەشمەنداز.

**چاوەنووارِ:** چاوەڕێ، چاوەڕووان، چاوەڕێگه.

**چاوەنووارِی:** چاوەڕێیی، چاوەڕووانی.

**چاوەنۆڕ:** چاوەڕووان، چاوەڕێ.

**چاوەنۆڕی:** چاوەڕێیی.

**چاوباز:** چاوباشقاڵ.

**چاوبازه** (بابا.): جووره گیایەکە دڕکاوییە سەربازەڵەی بەهارییە و دەخورێ گولێکی سپی دەردەکات، (هەو.) کەڵبەشه.

**چاوبازی:** چاوبڕکێ.

**چاوباشقاڵ:** چاوحیز، پیاو یا ژنێکە بەناپاکی تەماشای یەکتری بکەن.

**چاوباشقاڵی:** چاوەحیزی، تەماشاکردنی دووپیاو و ژن بۆ یەکتری بەناپاکی.

**چاوبەرەژێر:** شەرمەزار، چاولەبەر، تەریق، (هەورا.) چەم بەرەژێر.

**چاوبەرەژێری:** شەرمەزاری، چاوبەرەوژێر: چاوبەرەژێر.

**چاوبەس:** چاوبەست.

**چاوبەسان** (ئەردە.): چاوبەندان، چاوبەستران.

**چاوبەست:** جادووگەر، جادووباز، هەڵخەڵەتێن، دەستبڕ. دەسڕۆکەیەکی تایبەتییە چاوی منداڵانی پێدەبەسترێ.

**چاوبەستن:** بەپەڕۆیەکی چاوی خۆ یا کەسێکی بەستن، جادووکردن، فریودان.

**چاوبەستی:** جادووگەری، جادووبازی، هەڵفریوان.

**چاوبەسی:** چاوبەستی.

**چاوبەکل:** چاوڕەش، پیاو یا ژن چاوی خۆی بەکل ڕەش کردبێ، چاو داڕێژ.*

**چاوبەڵەک:** چاڤبەلەک.

**چاوبەند:** چاوبەست. ــ ی: چاوبەستی.

**چاوبەن:** چاوبەست، چاوبەند، جادوو.

**چاوبەنن:** چاوبەستن، فێڵ لێکردن.

**چاوبەنی:** چاوبەندی، چاوبەستی.

**چاوبڕ:** کەسێکە چاوببڕێ.

**چاوبرسی:** زگەڕۆ، نەوسن، سکەڕۆ، چاوچنۆک، (باک.) چاڤبرچی، (هەورا.) چەمبرسی، وەرەچەم ئاوره، بەرچاوتەنگ.

**چاوبرسێتی:** چاوچنۆکی، زگەڕۆیی.

**چاوبڕکانێ:** چاوبڕکێنی.

**چاوبڕکێ:** چاوبڕکێنی.

**چاوبڕکێنی:** چاوبڕکانێ، چاوهەڵتەکاندن، چاوبڕکێ، چاولێک هەڵتەکاندنی نێرینە و مێ یینەیەلە یەکتری، ــ کردن.

**چاوبڕین:** بڕینی ژوورەوەی پێڵووی چاوی مووداره.

**چاوبز:** چاوزەق، چاوبزۆک، بزبزۆک، چەمبز، ــ کردنەوه. تامەتامه، تامێ تامێ، کامێ کامێ، کامەکامه.

**چاوبۆره:** گیایەکی دڕکاوی بەهارییە وەک چاوبازه وایە بەلام ئەم بۆرەو ناخورێ.

**چاوبۆق:** چاوزەق، چاوزاق.

**چاوپرووشه:** کووسکووسک چاوی کزبێ و زۆری بترووکێنی.

**چاوپۆش:** لێبوور، لێبوورەر، بەخشەر، چاوقووچێن، هشازا.

**چاوپۆشان:** چاوپۆشی.

**چاوپۆشاندن:** چاوپۆشین.

**چاوپۆشی:** لێبووردن، لێبوورین، بەخشین، تخ، حا.

**چاوپۆشین** (باک.): چاوداپۆشین، لێ چاوپۆشی. لێبووردن، بەخشین.

**چاوپیاخشاندن:** تەماشاکردنی چتێک بەخێرایی.

**چـاوپیس:** کەسێکەچاو بەهەر گیان لەبەرێکی هەڵبێنێ زیانی پێ بگەیەنێ.

**چاوپیسی:** کەسێکە بەردەوام بە تەماشاکردن زیان بگەیەنێ.

**چاوپێکەفتن:** دیتن، بینین. چاوپێکەوتن، دیتنی چتێک. چاڤ لێکەتن.

**چاوپێوەبوون:** چاوتێوەبوون، بەتەنگەوەبوون، چاوتێبڕین.

**چاوپێهەڵنەهاتن:** خەزیاندن، خۆزیاندن، بەدخوازی، بەرچاوتەنگبوون، ڕژدبوون، داخشاندن.

**چاوپێهەڵێنان:** بەچاوەوەکردن، تەماشاکردنی مرۆ بە چاوی پیس و دڵی پیسەوە بۆ زیان پێگەیاندنی.

**چاوپێهەڵهێنان:** چاوپێهەڵێنان.

**چاوتاریک بوون:** کوێربوون، مەبەس لە تووڕەبوونە.

**چاوتەڕبوون:** مەبەس لەگریانە.

**چاوتەنگ:** بەرچاوتەنگ. ــ ی: بەرچاوتەنگی.

**چاوترەکاندن:** چاوترووکاندن.

**چاوترەکانن:** چاوقووچاندن.

**چاوترسان:** سڵەمینەوە لە کەسێک لە شتێک لەترس، تەمبێ بوون. *

**چاوترساندن:** تەمبێ کردن، پەند دان، هەڕەشەلێکردن.

**چاوترسێن:** کەسێکی گەورەیە لە ماڵێدا یا لەدەرەوەدا، کەلێی بترسێن.

**چاوترووکان:** چاولێکنران، چاوقووچان.

**چاوترووکـاندن:** چاولێکنـانێکی وایـە بەپەلـە پێڵووەکـانی چاوبخرێنـە سـەریەکتری ولێـک بکرێنـەوە، جـارە قووچـاندن و لێکنـانێکی چـاوە، بەیەکدادانی چاو.

**چاوترووکانن:** چاوقووچاندن.

**چاوترووکێن:** چاوقووچێن.

**چاوتێبڕ:** چاودێر، چاڤنێر، چاڤدێر، کەسێکە چاو ببڕێتە یەکێک یا چتێک بۆ ووردبوونەوە لە ئاخوتن و ڕەنگ و دیمەنی. تێرامـان بـە ووردی، خۆ لێخۆشکردن، سەرنج دان.

**چاوتێبڕین:** دلـهین، دڵدان، چـاوپێوەبوون، چـاولێکردن، تەماشـاکردنی گیان لەبەر یا چتێک و چاولێ نەترووکاندن، ڕووانین، چاو سەرخستن.

**چاوتێر:** چاڤتێر. ــ ی: چاڤتێری

**چاوتیژ:** کەسێکە چاوی زۆر هەنا بکات. ــ ی: چاو ڕوونی. *

**چاوتێوەبوون:** چاوپێوەبوون، بەتەنگەوەبوون.

**چاوچاویلکە** (خۆ. کۆ.): چاویلکە، برینێکی پیسە. گەمەیەکە بە مەرج دووکەس چاولێک دەکەن کامیان زووتر چاوی بقووچێنێ دەیدۆڕێنێ.

**چاوچەپەڵ:** چاوپیس.

**چاو چەپ و چێڵ:** چاو چەپ و ڕاست.

**چاوچەپوراس:** خێل، چاوگێڕ، خوێل، تیل.

**چاوچڕداگرتن:** وەخۆگرتن، چاوتێبڕین.

**چاوچروچێڵ:** چاو چۆڕاو، چاو دارژاو. *

**چاوچڵە** (ئەردە.): چاوسووتک، چاوپیس.

**چاوچلـە:** بازووبـەند، نشـتووی چـاووزاری. (ئـەردە.) چـاوپیس. بـازی بەندێکە، کەنوشتووی چاووزاری تێدەکرێ.

**چاوچنۆک:** چڵ، نەوسن، چـاونزێر، چاونـەزێر، (ڕەوا.) چاونزار، چڵێس، چاوبرسی، چنۆک، ڕژد، چەڵماس.

**چاوچنۆکی:** چاوبرسێتی.

**چاوچوونەخەو:** نوستن، وەرکەوتن، خەولێکەوتن، خەفتن.

**چاوچێڵ:** تیل، خێل.

**چاوحیز:** کەسێکە چاوی شکست و زەدەبێ، کەسێکە لـە ئاخـەفتنێدا چاو لـەزەوی بکا و نەروانێتـە دووێنەرەکـەی خـۆی، کەسـێکە حـیزێتی خـۆی بەچاوان بنوێنێ.

**چاوحیزکردن:** چاوداخستن لەشەرمان وئیتر.

**چاوحیزی:** شەرمەزاری، سەرشۆڕی.

**چاوخ:** (ئەردە.): تیرنج، بنباخەڵی کەوا و ئیتر، ژێرباخەڵی کەوا.

**چاوداجووریاگ** (ئەردە.): چاوهەڵگەڕاوەوە.

**چاوداخستن:** خۆشەرمەزارکردن، شەرمەزاربوون.

**چاوداری** (ئەردە.): چاودێری، چاویاری، چاوێری، دیدەوانی.

**چاوداگر:** (باک.) چاڤ یارسەک، بە غەمزە و ناز (ژن).

**چاوداگرتن:** ڕیک، ئاماژەکردن بەچاو.

**چاوداگیرسان:** چاوهاتنە ئێش بە کوتوپڕی.

**چاوداگیرسێن:** چاوگی ئاگر، دەستەچیلە.

**چاودان:** چاڤدێراندن.

**چاودان:** تەماشاکردن.

**چاودەر:** چەودەر.

**چاودەرپەڕان:** چاو زەق کردنەوە، تووڕەبوون. *

**چاودەرپـەڕاندن:** چاودەرهێنـان لـێ تونـدو تووڕەبـوون، ئـاڵۆزی کـردن، هەڕەشەکردن، تووڕەبوون.

**چاودەرپەڕانن:** چاودەرپەڕاندن.

**چاودەرپەڕین:** توندوتووڕەبوون.

**چاودەست بە ئێشکردن:** داگیرسانی چاو، دەست بەئێشکردنی چاو.

**چاودێر:** چاوتێبڕ، چاڤنێر، زیرەڤان، ئاگادار.

**چاودێران:** ئاگا لێ بوون، سەرپەرشتی. *

**چاودێری:** چاڤنێری، زێرەڤانی، ئاگاداری.

**چاورا:** چارەوێ.

**چاوڕاو:** چاووڕاو، دەنگ، باس.

**چاورە:** (هەورا.) چارەوێ، چاورا.

**چاوڕەش:** کەسێکە چاوی ڕەشبێ. نێوی ئافرەتانە.

**چاوڕەشە:** جۆرە ترێیەکە، (موک.) سەرقولە.

**چاوڕەشکەنە** (زەن.): دەستەچیلە.

**چاوڕەوشەن:** چاو ڕوون. ـــ ی: چاو ڕوونی.

**چاوڕشتن:** کل لە چاوکردن.

**چاوڕووان:** چاوەڕووان، چاوەڕێ.

**چاوڕۆشنکەرە:** چاوداگیرسێن، مزگێنی یەکە ببێتە هۆی چاوەڕوونی.

**چاوڕۆشنی:** چاوڕوونی، پیرۆزبایی.

**چاوڕوونکە** (هەو.): دەستەچیلە، بن ئاگر.

**چاوڕوونی:** پیرۆزی کردن لە یەکێک بەکوتنی چاوت ڕوون لە بارێکیدا، کەنامەیەکی خۆشی یاکەسێکی لەدوور هاتبێتەوە.

چاوڕێ

**چاوڕێ** (بار.): ڕەشە وولاخ.

**چاوزاق:** چاوزەق، چاوبۆق.

**چاوزەق:** (هەورا.) چەمزەق، بز، چاوبز، چاوبزۆک، بزبزۆک، ـــ کردنەوە. چاوزاق، چاوبۆق.

**چاوزەقی:** چەمزەقی، چاوبزی.

**چاوزرتکێ** (ئەردە.): جۆرە گەمەویارییەکە دووکەس دادەنیشن پێیان جوت دەکەن و شاڵێکی لە ملی هەردووکیان دەکەن، هەوڵدەدەن، کەیەکتری بلندکەن.

**چاوساخ:** کەسێکە دەستی کوێران بگرێ بۆ هاتو چۆیە، ڕێنیشاندەر. ـــ ی: دەستی کوێران گرتن بۆ هاتوو چۆیە.

**چاوسەرخستن:** چاوتێبڕین.

**چاوسپیلکە:** چاوبازە.

**چاوسووتک** (ئەردە.): چاوپیس، چاوچڵە.

**چاوسوور:** یاریکار، پشتیوان، سەید تەها لە ڕەواندزێ چاوسووری ئێمەبوو. ـــ ی: ئازایەتی، نەترسی.

**چاوسوورکەر:** چاوسوورکەرە، هەڕەشەکار.

**چاوسوورکەرە:** گەورەو سەرپەرشتکاری یەکێک.

**چاوسوورکردن:** چاوسوورکردنەوە، ڕق و کین هەستان.

**چاوسوورکردنەوە:** مەبەس لە هەڕەشەلێکردن و ترساندنە.

**چاووش:** چاوەش.

**چاوشارەکێ:** چاوشارکێ.

**چاوشارەکێ** (بابا.): خۆشاردنەوە، گەمەیەکی منداڵانە یەکێک چاوی دەقووچێنێ و ئەوانی تر خۆیان دەشارنەوە، گەمەیەکە، چاوشلکانێ.

**چاوشارکێ:** چاوشارەکێ.

**چاوشڕ:** چاوکول. ـــ ی: چاوکولی.

**چاوشلکانێ:** چاوشارکێ.

**چاوشیلکانێ** (هەو.): گەمەیەکی منداڵانەیە، خۆشاردنەوە. چاوشارکێ، چاوشلکانێ.

**چاوشۆڕ:** شەرمەزار، چاوبەرەژێر. ـــ کردن: چاوبەرەژێرکردن، چاوحیز. شووشەیێکە زارەکەی بەقەد چاوە ئاویا دەرمانـاوی تێدەکرێ چاوی پێدەشۆر ـــ ڕێ.

**چاوشۆڕکردن:** سەر داخستن. چاو بەرەژێرکردن.

**چاوشۆڕی:** چاوبەرەژێری، چاوحیزی.

**چاوشین:** چاڤ هەشین.

**چاوفڕین:** چاوپەڕین، لێدانی دەماری چاو.

**چاوقایم:** چڕ، نەترس، ئازا. ـــ ی: چڕی، نەترسی، ئازایی.

**چاوقرتاندن** (ئەردە.): چاووداگرتن.

**چاوقرتانن** (ئەردە.): چاوداگرتن.

**چاوقرتکێ** (ئەردە.): چاوداگرتن.

**چاوقووچان:** چاولێکنران.

**چاوقووچاندن:** چاولێکنان، چاونووقاندن، چاوبەیەکانیان، چاوپۆشی.

**چاوقووچانن:** چاولێکنان.

**چاوقووچانێ** (خۆ.): خۆشاردنەوە.

**چاوقووڵ:** چاوچاڵ.

**چاوقووڵکە:** چاوەقووڵە (ئازارێکە)، (کە.) بە چەوازی.

**چاوکاڵ:** چاوکەژاڵ، نێوی ئافرەتانە.

**چاوکاڵێ:** کەسێکە ڕەنگی چاوی وەکوو کەژاڵ وابێ.

**چاوکە** (ئەردە.): چاوگەی کانی، سەرچاوە، دەستەچیلە، دەساگر، ئاگرگیرە. سەرچاوکە.

**چاوکەژاڵ:** چاوکاڵ.

**چاوکەڵەشێر** (ئەردە.): چاوکەڵەشێرە، تۆوی گیایەکییە تۆوەکە سوورو وورردە وەکوو چاوی کەڵەشێر.

**چاوکەڵەشێرە:** تۆوی گیایەکییە دەنکەکانی سوورە وەک چاوی کەڵەشێر.

**چاوکەنن:** چاودەرهێنان.

**چاوکەووگ** (ئەردە.): چاوشین.

**چاوکردن:** بەدی کردن، دیتن.

**چاوکردنەوە:** مەبەس لە شارەزایی و بەڵەدبوونی یەکێکییە.

**چاوکز:** (هەورا.) چەمکز. ـــ ی: چەمکزی.

**چاوکسکە** (سەر.): گیایەکە.

**چاوکوتکە** (مەک.): جۆرە ترێیەکی سپییە گلووی خڕوسپی و ڕوونە دەنکی لە نێویدا دیارە.

**چاوکوتکە:** گیایەکی گەڵاخڕی گوڵ زەردە.

**چاوکول:** چاوئێش.

**چاوکولی:** چاوئێشە، (هەورا.) چەم ئێشە.

**چاوکونکە:** گیایێکە گەڵاخڕی گوڵ زەردە.

**چاوگە:** سەرچاوە. دیمەن. چاوگی ئاگر، دەستەچیلە.

**چاوگە:** زاروکونی برین، چاوە، یەک ژوور، یەکدیو.

**چاوگەداکەوتن:** دەمدانەوەو قووڵبوونی برین.

**چاوگەڕاندن:** چاوەچاوکردن.

**چاوگەڕان:** چاوەچاوکردن.

**چاوگەرمکردن:** کەمێک نوستن، سەرخەوشکاندن، لبلبان، چاوقووچان.

**چاوگێڕ:** چاڤگەڕۆک، چاوخووار، خێل، خوویل، تیل.

**چاوگێڕان:** بەملاوبەولادا تەماشاکردن بۆ چتێک.

**چاوگێڕی:** چاڤگەڕۆکی.

**چاولار:** خێل، چەپخوون. ــ ی: خێلی.

**چاولەبەر:** چاوبەرەژێر، چاوشۆڕ، شەرمەزار. ــ ی: چاوبەرەژێری، چاوشۆڕی.

**چاولەحەوا:** خێل، قیچ.

**چاولەدوو:** چاولەدووا، (باک.) ئازوەر، ئاز. ــ بوون: ئازوەرە، جلە.

**چاولەدووا:** چاولەدوو، ئازووەر، چتێکی دڵگرە، کە لە دەست چووبێ و چاوت هەر لە دووای بێ.

**چاولەدوویی:** چاولەدووایی، ئازووەری.

**چاولێبڕین** (ئەردە.): چاوتێبڕین، چاولێکەری.

**چاولێ بزرکردنەوە:** مۆربوونەوە لە یەکێکی.

**چاولێبوون:** دیتن.

**چاولێپۆش:** تخلێکەر.*

**چاولێپۆشین:** تخلێکردن.

**چاولێخشان:** چاولێخشاندن.

**چاولێخشاندن:** چاڤ لێدان.

**چاولێدان:** بەچاوەوەکردن.

**چاولێقووچان:** چاولێقووچاندن.

**چاولێقووچاندن:** چاولێپۆشین.

**چاولێکەر:** تەماشاکار، لاسایی کەرەوە.

**چاولێکەری:** (باک.) لاسایی، بەربەری، چاولێکردن.

**چاولێکردن:** تەماشاکردن، لاسایی کردنەوەی یەکێکی.

**چاولێککردنەوە:** چاوئاوەڵەکردنەوە، چاوهەڵێنان.

**چاولێکنان:** چاوقووچاندن، چاولەسەر یەکتری دانان، مەبەس لەمردنییە.

**چاولێگێڕان:** چاڤلێگەڕاندن.

**چاومەس:** چاومەست.

**چاومەست:** چاومەس.

**چاومزمۆر** (ئەردە.): چاوخەواڵوو.

**چاومۆڕ:** چاوزەق، توورە.

**چاونەترس:** چاوقایم. ــ ی: چاوقایمی.

**چاونەچوونەخەو:** نەنوستن.

**چاونەزێر:** مرۆی ڕژد.

**چاونەزێری:** ڕژدی.

**چاونەکردنەوە:** لەهەرباریکی و لە خەواڵوویدا چاو هەڵنەهێنان، ئاسوودە و بەڵەدنەبوون.

**چاونز** (هەو.): بەدکردار، بەدڕەووشت، ژنپەرست. ــ ی: بەدکرداری، بەدڕەووشتی، ژنپەرستی.

**چاونزار** (ڕەوا.): چاونزێر، چاوچنۆک. ــ ی: چاونزێری.

**چاونزی** (هەور.): بەدکرداری، بە دڕەوشتی، ژنپەرستی.

**چاونزێر** (موک.): چاونەزێر، (ڕەوا.) چاونزار، چاوچنۆک، چڵێس، چنۆک، نەوسن، ڕژد. ــ ی: بەهەجاندن، ڕژدی.

**چاونێرگسە:** (کۆ.) بزە، جۆورە ماسیەکە پوولەکەکانی کەمێک خڕدەنوێنن، چاوی زەردو سووورە وەک کارە.

**چاووڕاو:** هاتەهات، چاوەڕاو، بانگاشە، هەمەهەمە، چاوڕاو، بانگەشە، دەنگوباسی باش یا گەند لەبارەی چتێک یا کەسێکەوە بڵاوکردنەوە. بە ــ: هاشوهووش. ــ کەر: پارچەچی، بافیشکەر.

**چاووزار:** چاڤنی، (باک.) چاڤینۆک، چاوێنی، چەمەزەخم، چاوانی، چاوەزار، چا، نشتووی ــ.

**چاووش:** چاوەش.

**چاووگ:** دەستەچیلە، پووشوپەڵاشێکە ئاوری پێبکرێتەوە، سەرچاوە.

**چاوهەڵاتن** (ئەردە.): بڕوا پێ هاتن، بۆ تەماشاکردنی چتێک، ڕەوادیتن، چاوپۆشی، چاوکردنەوە.

**چاوهەڵبڕین:** سەربڵندکردن و چاو لەکەسێکی یا چتێکی کردن.

**چاوهەڵتەکاندن:** چاوبڕکێنی کردن، بەچاوڕیک کردن.

**چاوهەڵتەکان:** چاوهەڵتەکاندن.

**چاوهەڵگەڕیانەوە:** چاوهەڵگەڕانەوە لەبەر تەووژمی خۆش یا ڕق یا بیێتین.

**چاوهەڵگێڕان:** چاوهەڵگێڕانەوە.

**چاوهەڵگێڕانەوە:** بەڕق تەماشاکردن، لیمۆڕبوونەوە، چاومۆڕکردنەوە، تێکوڕک، چیلەکردن، چاوبەرزکردنەوە بۆ ترساندن یا بۆ شەڕو جنێو یا لە بەر ڕق ئەستووری.

**چاو هەڵنەهاتن:** ڕەوا نەدیتن.

**چاوهەڵهاتن:** چاوهەڵاتن.

**چاوهەڵێنان:** چاولێککردنەوە، چاوئاوەڵەکردنەوە.

**چاویار** (ئەردە.): چاودێر، دیدەوان. ــ ی: چاودێری، چاوەڕێیی، چاوداری، دیدەوانی.

**چاوێری:** چاودێری.

**چاوێشە:** چاوئێشە، چاوکولی، دەردێکە تووشی چاو دەبێ و گل ئەکا. گوڵە چاو ئێشە، بەیبوون.

**چاویلکە:** چاڤک، چاڤبەرک، (باک.) چاڤۆک، (باد.) پێشچاڤک، دووشووشەیە بە قەد چاو لە ناو چووار چێوەدەکی دوو قۆڵدارە بۆ تۆزو خۆڵ یا خووێندنەوە لە چاو دەکرێ. (کۆ.) چاوچاویلکە، کووزرەکە، (هەورا.) چەشمەک، دەردێکی گرانە لە دووایەدا دەبێتە برینێکی پیس.

چاویلکە

**چاویلکەدان:** قوتوو و کیفی چاویلکە.

**چاوێنی**: چاڤنی، (باک.) چاڤینۆک، چاوانی، چاوەزار، چاووزار، بێ ـــ: دوور لە چاووزار، بێ چاوانی، دوور لەچاوی پیس.

**چای** (باک.، هەورا.): چای ووشک، تۆچای ووشک، چایە. (باک.، هەورا.) چای لێنراوو دەمکراوە، کە بەئیستیکان بە تاڵی یا بە شیرینی دە خورێتەوە، سارد.

**چایەر**: بەشەو و ڕۆژ وولاغ لە دەرەوە لەوەڕاندن، لەوەڕ. (ڕۆژ.) فریز، فریزوو (گیا)، لەوەڕ، ئالفجاڕ.

**چاپالوون** (لو.): چاپالێو.

**چایچی**: (باک.) ژیڤان، چادەر، چایدەر، چاچی، چاپەز، چایپەز، قاوەچی.

**چایچێتی**: چاچێتی، قاوەچێتی، چایپەزی.

**چایخانە**: چاخانە، قاوەخانە.

**چایدان**: چادان، قۆری.

**چایەنی** (ئەردە.): باپەڕبوون، سەرماخواردوویی، (ئەردە.) ئارەقەی سەرەمەرگێ.

**چایی**: چا، تۆچا، چای لێنراو.

**چاییچی**: چایچی، چافرۆش، کەسێکە پیشەی هەر چالێنان و فرۆشتنی بێ.

**چاییدان**: چادان.

**چاییر** (باک.): چیمەن، چیمەنزار.

**چاییگ** (ئەردە.): سارد، سەرد.

**چایین** (ئەردە.): سەرمابوون، ساردبوون.

**چ ئەوێ**: چدەبێ؟.

**چەبت** (زا.): چەوت.

**چەپ**: چۆپ، چۆپە، لای چۆپەی، واژی لای ڕاست، بەرانبەری ڕاست لە لەش یا لەچتدا، لای باکوور. جیاواز، کەمی، نزم، ئەوکۆشکە چەپی نیە لەگەڵ هۆری: واتە زۆر لەیەکتری جیاوازنین و لەوی کەمتر و نزمتر نیە، (ئەردە.) چەپلە، کلا، کەنار، ماڵی ئازادی زۆر چەپە.

**چەپازلە** (کە.): زللە، شەقەزللە.

**چەپاڵ**: پارچە تەنراوێکی ئەستوورە و بێ نرخە.

**چەپاڵە** (ئەردە.، جا.): چەمۆڵە، چەپۆڵە، ناودەست، پارچەیێک لە چتێکی، لەپی دەست، بەری دەست، بەقەد ـــ یێ زەویم نیە: بەقەد بەری دەستی زەویم نیە. (ڕۆژ.، هەورا.) شەقەزللە، شەپەلاخە، (ئەردە.) شەپاڵە، پاڵ، پاڵەپەستۆ. ـــ دان: پاڵپێوەنان، زۆر، ئازا، سزا، یەزدان لە ـــ ی زۆردار بتپارێزێ. (کە.، کۆ.، هەمو.، بابا.): پارازتن، بەهاناوەهاتن، فریاکەوتن.

**چەپاڵەدان** (ڕۆژ.): پاڵپێوەنان، پەنادان بە یەکێک، کە هانات بۆ بێنێ.

**چەپاڵک**: چەپاڵ.

**چەپانن** (ئەردە.): تێتەپاندن، تەپانن.

**چەپاو** (سن.، کە.): تالان، برفێن برفێن.

**چەپاوکردن** (سن، کە.): تالانکردن، تێکدانی ئارامی، ـــ(سن.، کە.) لەلاوە بۆهاتن، ڕێگالێگرتن.

**چەپە**: (جا.، هەورا.) چەپلەر، (باک.) چەپرا، کەسێکە هەر بە دەستی چەپی کار بکات. (ئەردە.) چەپک، دەسک، دەسکەگوڵ و گیا و ئیتر، سەوڵی بەلەم لێخوڕین. دەستبەندی وولاخ، پێوەند پاشبەندی وولاخان.

**چەپەترۆک** (موک.): گیایەکە لە نێو دەغلاندا شین دەبێ.

**چەپەچاخ**: سیکارد، چەقۆیەکی گەورەیە، ساتور، قەسابان بەکاری دەبەن. قیمەکێش، جەخار، گۆشتکوت.

چەپەچاخ

**چەپەچەپ**: شلپەشلپی ئاوێ. چەکەچەکی پێلاوێ.

**چەپەر**: دیوارە، (ئەردە.) زیوارە، دەرکەیەکە لە تانۆک و شووڵی دروستکرابێ و بە تەیان چنرابێ، دیوارێکیشە، کە لە شووڵ و چریی دروستکرابێ و تنرابی. پەیک، (سۆ.) تارشە، پۆس، پۆستە، بەرید. سوپەر.

**چەپەربەن** (ئەردە.): ملپێچ، شاڵگەردن.

**چەپەربەندان**: بریتییە لەوێستانی چەند کەسێکی زۆر بەگردی چتێکیدا بە چەشنێکی، کە وەک تووڵی چەپەر لە تەنیشت یەکترییەوەبن.

**چەپەرچی**: پەیکاوەر، پەیکهێنەر، پۆستەچی.

**چەپەرخانە**: پەیکخانە، پۆستەخانە.

**چەپەک**: جێگای سووچ وکەنار و ڕێی هاتوو چۆی کەم بە سەرەوەبێ. بریتییە لە چەند جۆگەیێکی کەوانەدار لە ناو مەرەزەدا، کە لێژایی تێدا بێ تا ئاو هەموو شوێنێکی بگرێتەوە بەیەکسانی.

**چەپەکانە** (شا.): بەپشتی دەستی لەدەم ورووی کەسێکیدان.

**چەپەڵ**: خاوێن نەکراوەوە بۆ گەنم و دەغڵودان. ـــ بوون: ناخاوێن و پیس بوون. (سن.) پیس، ناخاوێن، پۆخڵ، چڵکن، گوڕی، گەن، بەد، پیس، گەنیگ، بۆهێلکە.

**چەپەڵکار**: بەدکار، بەدخوو، بەدسرشت، گەنەکار.

**چەپەڵۆک**: چەپۆکە.

**چەپەڵووک**: چەپۆک.

**چەپەڵی**: پیسی، پۆخڵی، قرێژی. (ئەردە.) گوو، پیسایی.

**چەپەنداز** (باک.): فێڵەزان، دەغەڵ. ـــ ی: فێڵ، دەغەڵی.

**چەپەوانە**: پێچەوانە، واروو، (ئەردە.) چەواشە.

**چەپەوانەیی**: پێچەوانەیی، چەواشەیی.

**چەپەیی** (کە.): چۆپەیی، جوورە هەڵپەڕینێکە.

**چەپچەپ** (فە.): شەقەشەقی باڵ.

**چەپچەپی باڵندان** (فە.): شەقەشەقی باڵی باڵندان.

**چەپخووس**: بەدخوواز. ـــ ی: بەدخووازی، دخسین.

**چەپخوون**: زیرەک، شەیتان، زیخ. خێل، چاولار.

**چەپخوون**: وولاخێکە لە پر ـــ ڕا لووشکەی باوێ لاسارو هارو هاج. (ئەردە.) شەبەیخوون، شەونخوون.

**چەپخێل**: قیچ. ـــ ی: قیچی.

**چەپڕاست** (ڕۆژ.): چرپانە، وولاخێکی بەرزەیە، کە لاقی ڕاست و دەستی چەپی سپی بێ. ـــ ی: سپێتی لاقی ڕاست و دەستی چەپی وولاخانە.

**چەپرەک**: بێکەڵک و کەنەفت و لە پێکەوتوو، چەپلەک، کۆن.

**چەپرەكی:** بێكەڵكی، چەپلەكی، كۆن.

**چەپك** (باك.): چەپڵە، جۆرە هەڵپەڕینێكی كوردییە. (ئەردە.) دەسكە گوڵ یاگیا، قول، باقە، تەنگە. دەست پێچێك لە خوری.

**چەپكە** (بابا.، فە.): چەپكە گوڵ وگیا و ئیتر، دەسك، دەسكە گوڵ وئیتر، باقەی دەغڵ و گژوگیا.

**چەپكەگەنم:** باقەگەنم، دەسكەگەنم.

**چەپكەگوڵ:** دەسكەگوڵ.

چەپكە گوڵ

**چەپكەن:** جۆرە كەوایەك بووە، كە لەمەو پێش لەلاتەنیشتییەوە هەڵدەدرایەوە. (ئەردە.) (تۆنێل) كونێكە ئەم سەرە و سەر دەكرێ لە ژێر شاخاندا بۆ هاتوو چۆیە. دەسكە گوڵ و ئیترە.

**چەپك چەپك** (كۆ.، هەو.): دەمدەمی، وازی وازی، وازوازی، سەرسەری.

**چەپكوتان:** چەپڵەلێدان.

**چەپكوتانن** (ئەردە.): چەپكوتان.

**چەپگا:** لای چەپ.

**چەپگەر:** زۆردار، بێداد، زاڵ.

**چەپگەرد:** زاڵ، زۆردار؛ مەبەس لە ڕۆژگاری نالەبارو كەچ ڕەفتاری. چەرخ، ئاسمان، گەردوون.

**چەپگەردی:** زاڵی، زۆرداری.

**چەپل** (باك.): دەسك و قوڵفی دیزە و گۆزە و ئیتر. (زا.) قۆڵی گیاندارانە.

**چەپڵە:** چەپك، (باك.) دێبول، بەهۆی شادی یا چتێكی سەیر هەر دووك بەری دەستان بەتوندی لێكدان بە چەشنێكی وا، كە دەنگی لێ بێت. — لێدان: چەپڵەكوتان.

**چەپلەر** (هەورا.): چەپە، چۆپە، مرۆی چەپە، (جا.) كەسێكە دەستی چۆپەی لە جیاتی دەستی ڕاستەی بەكاربیات.

**چەپڵەڕێزان:** بەدەستی گەل چەپڵەلێدان، چەپڵەلێدانی چەند كەسێك پێكەوە.

**چەپڵەڕێزانی** (هەو.): جۆرە گەمەیەكە.

**چەپڵەقوزێ:** مەبەس لە دەركردنی یەكێكییە لە شوێنێكی بەسووكی و قیرەقیر.

**چەپلەك:** چەپرەك، كەنەفت، كۆن، ناهەموار، كەل و پەلی شكاوكۆن.

**چەپڵەكوتان:** چەپڵەلێدان.

**چەپڵەلێدان:** لێدانی چەپڵە بەلەپی هەردووك دەستان.

**چەپڵەلێكوتان:** مەبەس لە بەدناو و ڕیسوا كردنی كەسێكییە.

**چەپ وچێر:** چتی خوارو گێڕ.

**چەپ وراس:** چەپ و ڕاست.

**چەپ وراست:** خاچ، چەلیپاوبۆ هەموو چتێكیش بەكاردەبرێ، كە ڕاست و چەپ تێكبەپرێ.

**چەپ و ڕاستكردن:** ڕاكێشانی دەستی ڕاست و قاچی چەپ، دەستی چەپ و قاچی ڕاست بۆ چابوونی ئازاری پشت بۆ بڕینی دەستی ڕاست و قاچی چەپ بەپێچەوانە بۆ سزادانیش بەكاردەبرێت.

**چەپۆغان:** كاركردنی پەنهانی.

**چەپۆك:** چەپەڵۆك، بەدەستی كراوەوە بە تۆقەسەری كەسێكیدا ماڵین، بەدەست و پاشووی وولاخانیش دەڵێن.

**چەپۆكان:** هەستانە سەر — : شاخكردن، چەپۆك وەشاندن، سمكۆڵ، هەردووك دەست بەزەویدا ماڵین، چالاخی، جڵفی، بزۆزی ئەسپانە.

**چەپۆكەسەری:** بەبەری دەسی لە تۆقەسەری كەسێكیدادان، چەپۆك.

**چەپ وگووپ:** چاپ وگووپ.

**چەپۆڵە:** چەمۆڵە، دەست و پەنجەی گیاندار.

**چەپۆڵەشێوە:** گیایەكی كوێستانییە لكەكانی كرژدەبن ورووەدەكەنەوە یەكتری وەكو چەپۆڵەی شێر.

**چەپۆڵەشێرە:** گیایەكی كوێستانییە لقەكانی ڕووەدەكەنەوە یەك وەكو چنگاڵی شێری.

**چەپێ** (ڕۆژ.): كەمێ، چكێ، نەختێ.

**چەپی:** چۆپی، جۆرە هەڵپەڕینێكە هەرلاقی چەپی تێدا پێش دەخرێ. چەپەوانە، بەپێچەوانەی ڕاستی. (ئەردە.) چرپی.

**چەت** (باك.): ڕازێنەر. (باك.) كەلێن، قەڵەمشت، تەگەرە. (موك.) كووزر، كووێزر، كۆزەر، ئەوپووش و پەڵاشەیە، كەلە گەنمی جووێ دەبێتەوە، كۆزەری دەغڵودان.

**چەتارە** (كۆ.، باك.): جۆرە پارچە (قوماش)ێكی ئاوریشمییە.

**چەتاڵ** (بابا.، كۆ.): خووار، خێچ، چەوت.

**چەتاڵ:** جووتەنێزەی دارە. سێپای دووربینان و تفەنگ و هەمووجۆرە چەكێكییە بۆ نیشانەگرتن. دووشاخە، دووگوێ، ئەستوندەی پێش خێوەتان. كەسەری دووگوێیە. دەواری گچكەیە. قولاپ، چنگاڵ، چنگاڵی نانخواردنێ.

**چەتاڵانە:** تووڕەكانە، ئەندازەییێكە لە دانەوێڵەلەسەر خەرمان دەدرێ بە سەركار بێجگە لە مڵكانەبۆ خاوەند ملك.

**چەتان:** پەردەی سەری عەرەبانەی خەرمان گوێستنەوەیە.

**چەتاندن** (شكا.): قرتاندن.

**چەتاوەروو** (بابا.): بێچاوەڕوو، بێشەرم، ڕووهەڵماڵراو.

**چەتە:** نێوی نێرینانە. ڕێگر، جەردە، تالانگر، خوێنڕێژ. (ئەردە.) پۆلیس، دزگیر.

**چەتەڕێ:** ڕێگای پێچاوپێچ وخوار.

**چەتەكاری:** جەردەیی.

**چەتەگەری:** چەتەكاری.

**چەتەل:** چەتاڵ.

**چەتەنە** (باك.): كێشكچی كەشتی.

**چەتەووڵ** (كە.، كۆ.): مرۆی زۆر درێژو ناقۆڵا، ڕەش و زل، زەبەلاح، (كە.) بلەزەندەر، (كۆ.) نافرەجا.

**چەتەیی:** چەتەكاری.

**چەتر** (موك.): سێوان، سەیڤان، بەرباران، سەریانە، (هەو.) سەیوان. بۆ پارێزگاری لە بارانە لەسەرسەر ڕادەگیرێ هەروەكوو سەیوان بۆ تیشكی هەتاو لە

چەتر

هاویناندا لەسەر سەر ڕادەگیرێ. (ئەردە.) سەرهەڵپاچراو لە بۆ داروودرەخت.

**چەترەقە** (همو.): ئەستوورکێکە بە کونجییەوە لەسەر ساجی برژابێ.

**چەترەقی:** چەترەقە.

**چەترباز:** ئەوکەسەیە بە چەتری لە بڵندییەوە لە فڕۆکەی دێتە خوار. ـــ ی: لەبڵندییەوە بەهۆی چەتر خۆ گەیاندنەوەسەرزەوی.

چەترباز

**چەتربوون:** لەپێکەوتن.

**چەترکردن:** خۆگیف کردنی قەلەموون، عەلەشیش و تاووس و چەترهەڵدانی تاووس و عەلەشیش و ئیتر. هەڵپاچینی سەری دارانە بۆ ئەوەی سەری وەکو چەتری لێبێت، بڕینی لکە بێکەڵکەکانی داران.

چەترکردن

**چەترمان:** فەرمانڕەوا، فەرماندار.

**چەترهەڵدان:** مەبەس لە خۆگیفکردنی قەلەموون (عەلەشیش) و تاووسە.

**چەتری ڕزگاری:** چەترێکە لە کاتی لێقەومانێدا لەسەر فڕۆکەی بە هۆی وییەوە خۆیان فڕێ دەدەنە سەر زەوی.

**چەتری هەتاوی:** ئافتاوگەردان، (باک.) سەهناف.

**چەتری هاوین** (باک.): ئافتاوگەردان، سەهناف.

**چەتفە:** چەفتە چەفیە، جوورە پارچەیێکی دەزوو و هەم ئاوریشمییە پیاوان دەیکەنە پێچی سەریان.

**چەتل** (باک.): مەزن، گەورە، زۆر.

**چەتلەمەز:** بزۆزو فێڵباز.

**چەتن** (ئێرە.): پێویست، پێداویست.

**چەتوو** (زا.): لەجیاتی کابرا بۆ پیاو بەکاردەبرێ.

**چەتۆر** (ئەردە.): قرانی زیوێنی زنجیرەدار، تیغی کولی ژەنگاوی.

**چەتوون:** چەتین، سەخت، دژوار، خنس. لاسار، بەدخوو، دژ، مەندەمۆڕ، هاروهاج، ناڕاست، ناهاڵ. ـــ ی: لاساری، سەختی.

**چەتیان** (ڕۆژ.): سنجاغ، دەرزیلە، دەبوس. (کۆ.) جوورە شیرێکە.

**چەتیم:** چەتیمۆک، حەیتە.

**چەتین:** چەتوون.

**چەتیو:** چەتیمۆک، کچەتیو، کچە هەتیو، کچی بێ باووک، پتر لەکاتی تووڕەیی و ڕق و کینەوە بۆ ئافرەتان بەکاردەبرێت.

**چەتیوە:** ناکەس بەچە، بۆ ئافرەتە.

**چەچ:** پەنجە، چەچلە، دەست لە زاراوەی منداڵاندا، (باک.) تەت، چەچە، چەچڵە.

**چەچان:** هۆزێکی کوردە.

**چەچە:** چەچ، چەچلە، زاراوەی ساوایان، (باک.) حونجەیی، ڤاڤێر. ـــ کردن: حونجەیی کردن، ڤاڤێرکردن.

**چەچەملان:** دەستەملان (لە زاراوەی منداڵاندا).

**چەچلە** (ئەردە.): چەچ، دەست، پەنجە.

**چەخەر** (باک.): پڕنووک، پڕتاڵ، خەت، شوێن، شووێنەوار. ـــ ابەز: شووێنی مەڕی.

**چەخت:** چەختی چۆپان، دونیا دیتوو، گوهتەمژی، سوواو، پێکراو، بێشەرم، زماندرێژ، چەقەسوو.

**چەختی چۆپان:** چەخت، بێشەرم، دەرهاتوو، چەقەسوو، گێتی دیتوو.

**چەخش** (زرا.، خۆ.): سوود، قازانج، دەرفەت، هەڵکەوت. بەرژەوەند، بەرژەند، بەرە. ـــ ی: خۆدیتن، بەرژەوەندی خۆ دیتن.

**چەخماخ:** چەرخ، چەقنەق. ـــ ی: جغارە (باک.) ئارپەشک. میلی تفەنگی، ماشە. (ڕۆژ.) پاشماشە. بەردی ـــ: چەقنەق، چتێکە پلیتەی تێهەڵدەکێشرێ وە جوورە بەردێکی تێدەخرێ و ئاوری پێدەکرێتەوە ئەستێ و بەرد، ئەستێ، تفەنگ.

چەخماخ

**چەخماخە** (هەورا.): برووسکە، بریسکە.

**چەخماخەی ئاسمانیْ:** برووسکەی ئاسمانیْ.

**چەخماخچی:** چەخماخساز.

**چەخماخچێتی:** چەخماخسازی.

**چەخماخساز:** چەخماخچی، کەسێکە تفەنگ و دەمانچەی دروست کات یا چاک کاتەوە.

**چەخماخسازی:** چەخماخچێتی.

**چەخموور** (ڕۆژ.): بەردی سپی و ڕەق، شەکری ڕەق. قەند.

**چەدەنە:** ڕیحانەی کێویلە.

**چەر** (باک.): چرا.

**چەرا** (باک.، سوور.): بۆچی، لۆچی، خۆروو، خاوێن، پاک وبێ پەڵە.

**چەرا** (همو.): لەوەڕ.

**چەراخۆخ** (باک.): بەشی ژوورەوەی مدبەقیْ.

**چەراگا:** لەوەڕگە، لەوەڕگا.

**چەران:** لەوەڕان.

**چەراندن:** لەوەڕاندن.

**چەرانن:** لەوەڕاندن.

**چەراوی** (فە.): پێچ، تیلاکی سەر.

**چەرە** (شکا.): لەوەڕ. (باک.) لەوەڕ، چێرێ.

**چەرەچەقان:** قەرەچناخ.

**چەرەخۆرە:** دارێکی کلۆرە سەرێکی بەرز دەبێتەوە بۆ ناو سەردۆڵیان، ئەوسەرەکەی تری بەسراوە بە کەوچکەوە دانەوێڵەی پێدا دێتە خوار بۆ ناو گەرووی بەرداش بۆ هاڕینی.

**چەرەدووکەڵ:** دووکەڵێکی زۆر ڕەش، کە ڕەنگی خووارد بێتەوە و بە جارێکی بێتەدەرەوە.

**چەرەز** (باک.، همو.، کە.): شەوچەلە، شەوچەرە، (باک.) چەرەس. نۆک و تۆکوولەکەی برژاو و لەبلەبی و ئیتر.

**چەرەس:** (سوێ، سەر.) جێگایەکی تایبەتیە لە نێورەزانـدا دۆشاوی لێدەکوشرێ و باسووقی لێ دروست دەکرێ. (باک.) تۆوی شووتی کاڵەکی و کوولەکەو ئیتری برژاوە. ـــ کرن: قرتاندن.

**چەرەگا** (هەورا.): لەوەڕگا، لەوەڕگە، جێگای لەوەڕ.

**چەرەگە** (شەق.): چەلاک، بەرچیغ. دارێکە دوو هەندی بەرچیغی درێژە، لەدەوروبەری تەختی نوستنی چەند دارێکی وا قایم دەکرێ تا دەورەی بەپەردە یا بە چیغی بگیرێت.

**چەرەن**: هەڵیت، چەڕن و پەڕن، پڕوپوچ.

**چەرەنن**: هاوارکار، بانگکار، بۆ مرۆ وولاخانە، چەرندە، ئەو چووار پێیانە، کە دەلەوەڕێ.

**چەرەنوبەرەن**: وورێنەکردن.

**چەرب** (هەورا.): چەور.

**چەربی** (هەورا.): چەوری.

**چەربیان** (ئەردە.): بەسەرداهەبوون، هونەر.

**چەرپا**: چارپایە.

**چەرپاندن** (باک.): لێدان، زللەلێدان.

**چەرپایە**: چارپایە.

**چەرپی**: (؟)

**چەرت** (کۆ.): سەتڵ، دەولکێکی گەورەی ئاوییە، (ڕۆژ.) ناعوور. ــ کردن: جیاکردنەوە، جوداکردن، هەڵبڕین، کاروبەرخ لە دایکیان هەلاواردن.

**چەرچەف** (فە.): ڕوودۆشەگ.

**چەرچی**: کرۆفرۆشیارێکە بەدێیاندا بگەڕێ، دێوەرە، کەسێکە وورده والا بباتە گوندان بەرۆن و دانەوێڵەی بگۆڕێتەوە.

**چەرچێتی**: کرداری کرو فرۆشیارێکییە، کە بە ناو دێهاتاندا بگەڕێ، دێوەرەیی.

**چەرخ**: سووڕی هەڵپەڕینییە، خول. ــ دان: خولدان، خولخوواردن، خولاندنەوە، هەرپلین. ــ پێدەر: هولوکەر. ــ ی ماکینە: تایەو پێچک و هەر مرازێکی خڕو شایانی سووڕان بێ. (کۆ.، هەورا.) چەخماخی تفەنگێ، چەخماخی جگەرەو ئاوور کردنەوە. ئاسمان، گەردوون، چەپگەرد، (فەلەک.). تیژ. ــ کرن: تیژکردن. (کە.) گرگرە، دۆلاب، جوورە غەرغەرەیێکی گەورەی سەربیرانە دەسکی هەیەو بەدەستی و چتیتر دەیسووڕێنن. گەرانی گێتی و گەردوونە. ئاسنێکی کەوانەدارە، کە لە سەرشان بسووڕێتەوە. (زەن.) باڵندەیێکە وەکوو داڵ وایە ڕاوی پێدەکرێ و زۆر گەورەیە، باڵەبان، (ئەردە.) باڵەوان. سەدە. ماکینە، ماشێن، ماشێنە.

**چەرخان**: سووڕان، خولخوواردن.

**چەرخاندن**: خولاندنەوە، سووڕاندن، گەڕاندن، هەرپلاندن، خولپێدان، هێنان و بردنی وولاخانە بەغار.

**چەرخانن**: چەرخاندن.

**چەرخە**: خولانەوە بەکەوانەیی، خول، گێچکە. غار. (جا.) ــ کردن: شەڕنەخێوی وولاخان، غاردانی وولاخانە بەدەورەدا. چەپکەن، کونێکە لە چیایان بە کونەوەدەری دەکرێ بۆ هاتوچۆ پێداکردنێدا. دەگۆڕاچوون، پێشگرتن، بەر بەرەکانی و بەرانبەری کردن، بەرەنگاری.

**چەرخەتوون** (باک.): کوورە، سۆبە.

**چەرخەتی** (خۆ.): بادییەکی گچکەی دەسکدارە یا کلکدارە دۆشاوو دانووی پێ هەڵدێنجن. (خۆ.) تریان و سەبەتەی گەورەیە.

**چەرخەچی** (هەورا.): جەزایەرچی، جەزایەچی، نۆبەتچی، کێشکچی، پاسەوان. ئاوگەردان.

**چەرخەدان**: سووڕانەوە بە گردی چتێکیدا.

**چەرخەکردن**: خولخوواردن بە گردی چتێکیدا.

**چەرخەمە**: سەوەتێکی گەورەیە لە قامیشی دروست دەکرێ.

**چەرخەوان**: بەڕێوەبەری ماکینان، هەڵسووڕێنەری ماکینان.

**چەرخچی** (باک.): هەرزەگەڕ، ئاوارە.

**چەرخەچێتی**: بڕوانە: چەرخچی.

**چەرخ خوواردن**: خولخوواردن، سووڕان، گەڕان، چەرخیان.

**چەرخخووس**: چێشتێکە لە جۆی فەریکی بۆ دراو، کە بە دەستاڕ کرابێتە چەند پارچەیەک.

**چەرخدان**: چەرخاندن.

**چەرخەدەزگ هەڵکردن**: چەرخی دەزوو هەڵکردنێ، پارەهەڵکەر.

**چەرخ شیرەچی**: دۆلاب و چەرخی میوە و چتی تر کوشین.

**چەرخ لەچەمەرکێشان**: بڕێتییە لەبەر دەستکردن و سزادانی یەکێک.

**چەرخ موتاوی**: چەرخێکە خوری پێ دەڕێسرێ.

**چەرخ و فەلەک**: لەلووک، لەیلووک، لەلووکی جێژنان.

**چەرخ هەوریشم**: چەرخی ئاوریشم.

**چەرخی**: جوورە پارەیەکی کۆنی زێوینی گچکەیە پێنج پارە قرۆشێک بووە. (موک.) جوورە گوڵێکە. (ئەردە.) گرد، خڕ.

**چەرخیان** (ئەردە.): خولخوواردن، گەڕان، خولیان، گەڕیان.

**چەرخین** (باک.): گەڕان، غاردان، گەڕانەوە، چەرخیان.

**چەرد**: گەردە، چەرمێکی گەورە (دۆلکە) یە ئاوی پێ لە چۆمی هەڵدێنجن.

**چەرداخ**: دەواری هاوینانە. کەپری نێو بێستان و باخ و باخچانە.

**چەرداوڕوو**: چەتاوەڕوو ناوی تیرەیێکی کووردە لە نێوانی سنەو هەمەدانێدا.

**چەردە** (بابا.): شکارتە. تاڵە ڕەنگێکە بە ڕەشی بنوێنی.

**چەرس** (ئەردە.): چەبەنگ، گیایەکە وەکوو تریاک دەکێشرێ.

**چەرق** (باک.): قرچەی شکانییە.

**چەرقوبەز** (باک.): جوورە هەڵپەڕینێکە بەجووتە سەردەگرێ.

**چەرقین** (باک.): تەقەتەق، خشەخش، سەرزەنشکردن.

**چەرم**: گووێن، پێست، پۆس، پۆست، پۆسە. ــ ی خۆشکراو: سەختیان، چەرمی خاراو. ــ ی خۆشنەکراو: چەرمی خاو.

**چەرماق**: (باک.) چەرمەلاق، چەقە، چەقاڵتە.

**چەرمای چەما** (هەورا.): سپێنەی چاو.

**چەرمە** (جا.، هەورا.): سپی.

**چەرمە چەقاڵت**: گۆشتی لەڕولاواز یا ئاژاڵی لەڕولاواز.

**چەرمەسەرە**: ڕەنج، پەتپەتێن، ئازار، مەخسەرە، دەردەسەری.

**چەرمەسەرێ:** دەردەسەری.

**چەرمەک** (هەورا.): سپی.

**چەرمەڵ:** سپیکەڵە.

**چەرمەڵانە** (ئەردە.): سپیکەڵە، سپیپات.

**چەرمەڵە:** سپیکەڵە، (لە) نیشانەی گچکەیە.

**چەرمەنیمو هێڵەی** (هەورا.): سپێنەی هێلکە.

**چەرمە نێو هێڵەی** (هەورا.): سپێنەی هێلکەی.

**چەرمچی:** بۆنگچی، کەسێکە، کە پێستەی خۆشکات، پێس خۆشکەر.

**چەرم خۆشکەر:** بۆنگچی، چەرمچی.

**چەرم خۆشکریاگ:** چەرمی خۆشکراو.

**چەرمقین** (ئەردە.): چرچ و لۆچی کاڵا و چتی تر.

**چەرمک** (باک.): پەردە و تووێژی پێستی کرکرۆچکەی کەپۆ. ـــ ی چاف: پەلکی چاو.

**چەرمکاندن** (باک.): لۆچکردن، قەدکردن، چیندارکردن.

**چەرمگ** (فە.): سپی، چتی سپی.

**چەرمگەربوون** (ئەردە.): ڕەوشەن و دیاربوون، ئاشکرابوون.

**چەرمگسوور:** مەری دەم و چاوومل سووری لەش سپییە.

**چەرمگی** (ئەردە.): سپێتی.

**چەرمگی بێخ ناخوون:** سپیاتی بن نینۆک.

**چەرمگی چاو:** سپێنەی چاو، چەرمینەی چاو.

**چەرمگی ناوچاو:** سپیایی نێوچاوانی ئەسپ.

**چەرموو** (زەن.، جا.): سپی.

**چەرمووسوور:** چەرمگ سوور.

**چەرمووک:** باژێرو شارێکی کوردانە لە ژێر دەستی تورکاندایە.

**چەرمووگ** (زەن.، جا.): سپی.

**چەرمی** (دەل.): سپی.

**چەرمیگ:** سپی.

**چەرمیلە:** چەرمەڵە، سپیکەڵە.

**چەرمیلە:** لەچەرمی دروستکراو.

**چەرمین:** چتێکە لە چەرمی دروستکرابێ.

**چەرمینە** (ئەردە.): چەرمین، چتێکە لە چەرم دروستکرابێ.

**چەرمێنە** (هەورا.): سپێنەی چاو یا هێلکە. (ئەردە.) سپێنەی هێلکە.

**چەرمینەی چەم:** سپێنەی چاو.

**چەرندە:** گیاندارێکە بلەوەڕێ.

**چەروو** (فە.): چەوور.

**چەروا** (فە.): چارەوا.

**چەروەدار** (لو.): چاروێدار، قەتارچی.

**چەروەی ئاهنین** (فە.): ئەسپە دارینە، دووچەرخە، (پایسکل).

**چەڕیان:** لەوەڕان، لەوەڕین.

**چەڕیاندن:** لەوەڕاندن.

**چەریک** (ئەردە.): خێلسات.

**چەرین** (بابا.): لەوەڕین.

**چەزگە:** چێژگە، چستگە، چەشە، چەشگە، چشگە.

**چەزگەی وێژەیی:** چەشەی وێژەیی.

**چەس** (جا.): چیە؟

**چەسپ:** چڕ، چریشە یا کەتیرە و جیوە و چتێکی تـرە، کـە بگیرێـتەوە، قاریسەک، لحیم. بەرگ و پۆشاکی تەنگ و تەسکە یا چتێکە، کە بە شـوێنێک تونـدو پڕبـە پڕبـێ. ئـەوەندەی ترياکێکـە، کـە بەشـی جـارە کێشانێکی بکات ـــ ی پێدەڵێن. ـــ یک: سەرێک لەتریاک.

**چەسپان:** خێرا، گورج، تەڕدەست، ئازا، فرز، کرژ، بەپەلە، بە تاڵووکە. چەسپین.

**چەسپاندن:** جێگـیرکردنی چتێـک لـە شـوێنێک، پێـوە نووسـاندن و لکاندنی چتێک بە شوێنێکەوە یا بە چتێکی ترەوە.

**چەسپانن:** چەسپاندن.

**چەسپدار:** مچ، لیچق، دەموشت. ـــ ی: مچی.

**چەسپنە:** چەسپندە، نووسەک، پێوەنووس.

**چەسپنەگی:** لکان، لکیان، چەسپین.

**چەسپیان** (ئەردە.): چەسپین، لکان، لکیان.

**چەسـپین:** چەسـپان، نووسـان، پێوەنووسـان، جێگـیربوونی چتێـک لـە شوێنێک پڕبەپڕ، پێوەنووسانی چتێک بە چتێکی ترەوە.

**چەسپێن:** نووسێن.

**چەسن** (ل.): چەس؟، چییە؟.

**چەش:** گیاندارێکی ڕاوییە، کە دەمـی شیرین بووبێ بەگرتن و خواردنی نێچیر، (فە.) چاو، چەم. (شار.) گیانلەبەرێکی ڕاوییە، کەمزاری فێرە نێچیر گرتن بووبێ. (ڕۆژ.، کۆ.) فێر، ڕا. ـــ بوون: فێربوون، ڕاهاتن. ـــ کردن: فێرکردن، ڕاهێنان، بۆ سەگ تاژی بەکاردەبرێت بۆباڵندە.

**چەشانن:** پێچێژتن، چێژاندن، مەزانن، مەزاندن.

**چەشە** (کۆ.): خـۆراک و دانێکـە، کـە بۆ نێچیران لـە نـاو تەپکەو تەڵـەو ئیتر دادەنرێت، کە بیخـوا و پێوەبێت، (هەورا.) چەشتە. تام، چێژ. ـــ کردن: چێژتن.

**چەشەبوون:** فێربوون، ڕاهاتن، چەشی بوون، بۆ باڵندەو سەگ و تاژی.

**چەشەخۆرە** (هـەورا.، کـە.): دانـەخۆرە، چێر، بـۆ مـرۆو ئـاژاڵ و بـاڵندان بەکاردەبرێت، گیاندارێکە چەشە بخوات و بەتەڵەوەنەبێت.

**چەشەخۆرەکردن:** دانە خۆرەو چێرکردن.

**چەشەکردن:** چەشکردن.

**چەشبوون:** دەم شیرین بوونی گیانداری ڕاوییە بەگرتن و خواردنی نێچیر.

**چەشتە:** گیانداری چەش، خۆراکێکە بۆ گرتنی نێچیران بەتەڵەوە دەکرێ.

**چەشتەبوون:** چەشبوون.

**چەشتەخۆر:** چەشەخۆرە، باڵندە یا گیان لەبەرێکە، کە چەشەی خواردبێ. ـــ کردن: چەشتکردن.

**چەشتەی** (هەورا.): چەژتن، چێژتن، چەشتن.

**چەشتن:** چێژتن، تاقی کردنەوەی تامی چتان بەزمان، چەشین، چەشەکردن، مەزین، مەزەکردن.

**چەشکە:** چێژ، تام، چەشە، مەزە، (ئەردە.) میلاق، مێلاک.

**چەشکەکردن:** چەشکردن، فێرکردنی گیاندار بە دەرخوارد دانی چەشە. چەشتنی خواردنەمەنی.

**چەشکز** (فە.): چاوکز.

**چەشمە** (فە.، لو.): کانی، سەرچاوە، چاوە، سەراو. (هەو.): ئاودەست.

**چەشمەچی** (هەو.): ئاودەست خاوێنکەرەوە.

**چەشمەک** (هەورا.): چاویکلە.

**چەشمک** (باک.): دەرمانێکە بۆ پارێزگاری چاو بەکاردەبرێت.

**چەشمیک** (بابا.): جوورە دەرمانێکی چاوانە.

**چەشن:** تەرز، ئازین، ئێسک، جوور، وێنە، چەشنەت، تەحر. بەو ـــ ە: بەوجوورە، ئاوا.

**چەشنە** (ڕۆژ.): پشک. ـــ ئاوێژتن: پشک ئاوێژتن، پارەوپارتێن.

**چەشنەت** (باک.): چەشن.

**چەشنی:** (هەو.، هەورا.، بابا.، جا.) ترەقە، تەرەقە، تەریقە، تەرەقەی دەمانچە و تفەنگ و چەکانە. مەزە، تام. (ئەردە.) کەرەکیفەی سەرترشی و ئیتر.

**چەشیت** (باک.): چەشن.

**چەعف** (زا.): چاو.

**چەعفک** (زا.): چاویلکە.

**چەغانە:** جوورە سازێکە.

**چەغە:** چغ، چغە، دەنگێکە بۆ دەرکردنی سەگان بەکاردەبرێت.

**چەغەچەرغ:** چغەچغ، چغچغ، دەنگێکە بۆ دەرکردنی سەگان بەکاردەبرێت.

**چەغەرە** (خۆ.): چەقەرە، گیاندارێکە لەبنەڕەتەوە بڕابێتەوە، کە بووژاوە و کارتەی دەرکرد ـــ ی پێدەڵێن.

**چەفت** (ڕۆژ.، کۆ.، جا.، هەورا.، دەر.، فە.، لو.): چەوت، خووار، لار، خێچ، چەفتیاگ.

**چەفتە** (ڕۆژ.): چەتفەی ئاوریشمی، کەلە سەردەبەسترێ، پارچەیێکی ئاوریشمییە بەسیم یا بە سوورمە چنراوە. داڵیت، داربەست. (ئەردە.) درۆ، بوختان.

چەفتەرێز

**چەفتەرێز:** ئاڵقەرێز، ئەلقەرێز.

**چەفتەکەڵ:** چەوتەکەل، گاجوتێکە تەمەنی چوار ساڵ بێ.

**چەفتەلی** (ئەردە.): باڵاپۆشێکی ئافرەتانە، وەک چەفتەی بە سوورمە چنراوە.

**چەفتەیی:** تەنجامەی دەرگا.

**چەفتەوراس:** چەفتەوڕاسە، چەنگەڵ، قولاپ.

چەفتەوراس

**چوفتەو شەڕە** (ئەردە.): چەوتەوچیلە، تەماشا، ووردبینی، سەرنج.

**چەفتی** (ژاوە.): خواری، بەوار.

**چەفتیاگ** (ئەردە.): چتی چەماوەوە، لار، گیرپاگ.

**چەڤی** (باک.): چەفتە، چەفیە.

**چەڤیە:** چەتفە، چەفتەی ئاوریشمین.

**چەڤیەوناگاڵ:** چەتفەو حەگال.

**چەڤانەک** (باک.): ئانیشکی ڕێگایان. چۆمێکە لە ئاسیای گچکەدا.

**چەڤاندن** (باک.): دەستڕۆیشتن، دەستەلاتداری. بادان، پێچدان.

**چەڤەر** (باک.): جوورە دارێکی چەمانە.

**چەڤرەبی** (باک.): جوورە دار بییەکە.

**چەڤی** (باک.): خووار.

**چەڤیان** (باک.): چەمین، خواربوونەوە.

**چەڤیای** (باک.): چەماوەوە، خواربووەوە.

**چەق** (ئەردە.): ڕەگی سپی، پەی. بن، بێخ، ڕیشە. (هەورا.) لەڕ، لاواز، (گۆشت)، ئاژاڵ یا ماڵاتی لەڕولاواز. لاگرنی گرنیەکەی جگییە، قیزە. کەسێکە گیریێ لە کڕین و فرۆشتنێدا، چەقەسوو، سەخت. (هەورا.) چەقە، چەقاڵتە. (موک.): جەرگە، نێوەڕاست، ڕێباز، دارا لەسەر ـــ ی ڕێگایە ڕاوەستاوە: واتە لە سەرنێوەڕاستی ڕێگایەدا ڕاوەستاوە.

**چەقاڵە:** بادامی تەڕ یا ووشکی چکۆڵەی کێوییە، چووالە، چەقێلە، دەنکک، دەینک، چووالە بایەو. دار ـــ : چووالەشێنکە، باهیڤوایم، بایەف، شڤشینک، کالەشین، شەواڵشینک، چەقێلە، ئاوکی تاڵەو هی شیرینیشی هەیە، کە خۆشکرێ دەخورێ. (ئەردە.) چەغالە، میوەی نەگەیشتوو لە ڕیزەی قەیسی و هووڵوو، بادام.

**چەقاڵتە** (ئەردە.): پیر، لەکارکەوتوو، داکەوتوو. چتێکە لە نێوانی گۆشت و بەزیدایە لە پێست نزیکترەو بەکاری خواردن نایەت. (هەورا.) چەق، چەقە، چەک، یائاژاڵ و ئیتر.

**چەقاڵ و بەقاڵ:** بریتییەلە مەردومی هەرزەی بازاڕی.

**چەقان:** چکلان، چەقین، دامەزرانی ئالاوگیاو ئیتر. چەقەنەی هەڵپەڕین و سەماو ئیتر.

**چەقانە** (ئەردە.): چەقەنە، چەغانە، تاڵ.

**چەقانەژەن:** چەقەنەلێدەر، پلژەن، پلتەقێن، سەماکار.

**چەقاندن:** چەقاندنی داروردرەخت و نەمام و ئالاوئیتر، داچکاندن، داچکیلاندن، چکلاندن، دارناژتن، چاندن. دامەزراندن، کوتانی چتێک بەزەویدا.

**چەقاندنەوە**، ڕەنج ونازاردانی مەمکی دایکە لەلایەن منداڵی شیرە خۆرەیەوە، کەزۆر ئازاری بدات، چەوساندنەوەی مەمک. دامەزراندن، دووبارە چەقاندن.

**چەقانن:** چەقاندنی دارو سینگ و بەرد و ئیتر، ناشتن.

**چەقاو:** چەقیو، چەقێنراو، دامەزراو.

**چەقاوەسوو:** چەقەسوو، بێشەرم، سوواو، ڕوودامالراو، چوختی.

**چەقە:** شیرەی کۆلکی گیایەکییە وە بنێشتی دەچێ، (هەورا.) کۆکلاخ. چەقاڵتە، چەق، چەقبەردە، چتێکە لە نێوانی گۆشتی و بەزیدایە وە پێستێکی تەنک دەچێ و بۆ خواردن دەست نادات. هەراهەرا، چەنەبازی، چەقەچەق. (کۆ.) چیرەوە، بێشەرمی، کوتن و دەنگی

کوتنییە، قسەی بێهوودەکردن. لە جگێنێدا دوای هەڵاویژتن یا پاڵ پێکەوە بنێن کەس نایباتەوە دووبارە هەڵیدەدەنەوە پێیدەڵێن.

**چەقەبۆق:** بۆقی ووشکانییە.

**چەقەبی:** جووره دارەبییەکە لە قەراغ ئاوان دەڕووێ بەڵام کورت و لاروکێڕ.

**چەقەتە** (ڕەوا.): بێشەرم، چەقەسوو، چەنەباز، زۆر وەڕ. (ڕەوا.) نیوە کوڵاو (بۆگۆشت) تا بۆگەن نەبێ یا نیوەبرژاو.

**چەقەچەق:** هەراهەرا، (کۆ.) چیرەوە، چەقبەردەچەقبەردە، چقەچق، چەقەی یەک لە دووی یەکتری مرۆ و ئاش و ئیتر، چەقەسوویی. ـــ کردن: گاڵین.

**چەقەچەناو:** (؟)

**چەقەچناوە** (کە.): قەرەچەناخ، زۆربڵێ، چەرەچقان، چەنەباز.

**چەقەخانە:** شوورێنێکی تایبەتییە بۆ کۆبوونەوەو تێدا ئاخەفتنێ.

**چەقەر** (ڕەوا.): جێگایەکە پڕشاخ وبەردەڵان بێ.

**چەقەرە:** چووزەرە، چووزەڵە، هەر تۆوێکی بچێنرێ ئەوەی، کەلە پێشدا دەری دەکا ، کە بەقەد دندووکی چۆکەیەکیە و سپییە ـــ ی پێدەڵێن، کە درێژتربێ چووزەڵەی پێدەڵێن، پیوازوکرتۆپە (پەتاتە) نەشچێنرێ لە بەهاراندا ـــ ی دەردەکەن، (هەورا.) چەکەرە، (هەو.) تۆقەسەری چیایانە.

**چەقەرۆ** (خۆ.): هەراهەرا، قیژەقیژی منداڵانە. سەگوەڕ.

**چەقەسوو:** بێشەرم، بێچاوەڕوو، سوواو، ڕوودامالراو، پەل، چوختی، چەختی، چەختی چۆپان، ڕووکراوەوە، چەقاوەسوو، چق، کەسێکە لە چەقەکردنێدا سووابێ. ـــ بوون: سیوادبوونەوە، شەرم شکان، ترس شکان، سووران.

**چەقەڵ** (ئەردە.): پاچکە، پێچک، قاچ و قول. (هەو.) توورگ، (باک.) تۆری، تووری، (بل.) تیروو، واویک. داعبایەکی کێوییە لەڕەسەنی سەگییە بەڵام کلکی ئەستوورترو قەپۆزی باریکترە. هەر جێگایەکی لە تۆقەسەری کێوان یا لە کەناریان یان لەبەرقەدیان بڵندوقیت بێ (چەقەڵ) ی پێدەڵێن. لەڕ، لاواز. (بل.) لووتکەی چیایەکی بەسەر لایەکیدا شۆڕ بێتەوە. پێچک، ئەم مێزە چووار چەقەڵە، واتە چووار پێچکە.

**چەقەڵ:** (هەورا.) بەردەڵان، چقڵ.

**چەقەڵاخ** (ڕۆژ.): کەمێڵە، تاڵ، پشکەڵ وپیساییکە لە بەهاراندا، کە ماڵاتان و ئاژاڵان دوای ئەوەی، کە بەخۆیاندا دەفیڕێنن بە پاشڵیانەوە دەنووسێ.

**چەقەڵە:** چەقاڵەی خۆرسک، چەقاڵەی تاڵ، لەنێو خوێیاوکێدا دەیکوڵێنن و پەروەردە دەکرێ تاڵایی نامینێ، چقانە، چەقێڵە، هی شیرینیش هەیە.

**چەقەلووس** (باک.): کولیین جۆ، چەلخووس.

**چەقەن،** زەوی ڕەقەن و سەخت.

**چەقەنە:** چەقان، چەقەنەی هەڵپەڕین و سەماونێتر، چەقچەقە، شەکەرۆکە و سەماکاران لە قامکیان دەکەن، (هەورا.) چەقان، (کە.) چەقەوانە، چەقێنە. ـــ ی ئاشی، چەقچەقۆک، چەقێنە، چەرە خۆرە، ئەودارەیە، کە بە کەوچکەوە (چەرەخۆرە) دە بەستراوە، کە دەچێتە ناو دۆڵیان وسەرەکەی دیکە لەسەر بەرداش هەڵدەبەزێتەوە ودانەوێڵەی دەدەرێنێتە خوارەوە بۆ ناو گەرووی بەرداش. (باک.) چەقچەقە، گیایەکە. پلتەقاندن، بەقامکی دەستان، دارێکیشە بەرێکی دەگرێ وەکوو بەری مۆرد.

**چەقەنەباز:** کەسێکە چەقەنەی لێبدات، پلتەقێن، (ئەردە.) چەقەنەژەن.

**چەقەوانە** (کە.): (هەورا.) چەقان، چەقەنە، چووار پارچەی زەرد یاکانێکی ترە شەکەرۆکەوسەماکەران لە قامکیانی دەکەن لەکاتی سەماکردنێدا چەقەنەی پێ لێدەدەن.

**چەقبەردەچەقبەردە** (کە.): چەقەچەق.

**چەقچەق** (باک.): چەقەچەق.

**چەقچەقە:** گیایەکە گەڵای لە هی داربی دەچێ و باریکترە. گیایەکە بەهارییە و بۆ کەسێکی دەنگی نووسابێ جۆشدەدرێ و دەخورێتەوە. گیایەکی دڕوییە و بستێک بڵند دەبێ وەهی گوێنی دەچێ چەند گوڵێکی سوور یا شین یا سپی فوو دراو دێنی منداڵان لە نێوچاوانی خۆیانی دەدەن دەیتەقێنن، تێولتەقینە، تەقتەقۆک، چەقچەقۆک، چەقنە، ئەم گیایە شیرێکی زۆر تاڵ دێنێ. (لو.) قەزوان. چەقەی ئاش، چەقچەقەی ئاش و چتی وەکوو وی. (ئەردە.) کاسنی، گولیلی. (ئەردە.) گیایەکی خۆرسکە لە قەراغ جۆم و کشت و کاڵاندا سەرهەڵدەدا لکەکانی کورت و ریشەکەی ئەستوورن گوڵەکانی شینن، لە پزشکیدا ڕەگ و ریشەکەی بە کوڵاوی بەکاردەبرێت تابرو هێزدەری جیکڵدانیە، ریشەکەشی دوای ووشکبوونی بە کوتراوی وەکوو قاوەی بە کاردەبرێ بەڵام تام و بۆنی وی نادات.

**چەقچەقەبەرگاویلکە:** باڵندەیێکی چکۆلەیە هەر چەقەچەقیەتی ولەگەڵ جووتێران بەناوخەتاندا دەگەڕێ.

**چەقچەقەی بنگونان:** (هەو.): گەمەیەکە.

**چەقچەقۆک:** گیایەکی بەهارییە گەڵای خڕە و بەرێکی وەکوو گێوژی دەگرێ بەڵام گچکەترە.

**چەقچەقۆکە:** شەیتانۆکە، ئێسکێکە وە کەشکۆڵی دەچی بە قەد گوێزێکی گچکە دەبێ لە چۆلی زیندەوارێکی لەناودایە، چەقچەقۆک. (کۆ.) گیایەکە گەزێک بڵندتر دەبێ گوڵی شین دێنێ وەهی حاجیلەی دەچێ، بە سووتاوی لەگەڵ ڕۆنی بۆ ئاورە و بیرۆ زۆر باشە. (باک.) چەقچەقە، چەقچەقەی ئاشی، کە بە گەرووی ئاسنی گرێ دەدەن دەخڵی پێدا دێتە خوار، کە وە بەردی ئاشەکە بکەوێ بۆیە چەقچەقەی پێدەڵێن.

**چەقچەقۆلک** (باک.): گەمەیەکە.

**چەقڵاندن** (باک.): تەقەتەقکردن، چەقچەقکردن، کە دووبەرد لێکدرێ تەقەیان لێوەدێ.

**چەقز:** قوناخ، بنەکە. میوانخانە.

**چەقک** (باک.): باڵندەیەکە.

**چەقلانقۆچ** (لو.): دەنگی قەزوان قرتاندن.

**چەقلەبەرد** (ڕەوا.): جوورە بڕوێشێکە لە شوورێنێکیدا، کە دەستار دەست نەکەوێ بە دوو بەردان گەغی پێدەکەنە بڕوێش سابەو جوورە بڕوێشە دەڵێن : ـــ .

**چەقلەمەست** (شکا.، باک.): ماستاوی خەست.

**چەقماق** (باک.): چەخماخ.

**چەقنەق** (باک.): بەردی چەخماخی تفەنگییە.

**چەقۆ:** چێر، بەنبر، چەقوو، کارد، (تیغ)، تیغێکی مشتۆ دەسک دارە دەمەکەی دەنوشتێتەوە بۆ ناو دەسکەکەی.

**چەقوو** (باک.): چەقۆ.

**چەق و تەف:** گرویف، گۆلێژە.

**چەق و چۆق:** ددانەچیرە، چۆقە چۆق، شەقەشەق، دیانەڕووکە، چرقەچرق، لەکاتی سەرما یان تاولەرزێدا دەنگی لێدانی ددانە.

**چەقۆساز:** کێرکچی.

**چەقۆگەر:** کەسێکە چەقۆی دروستکا.

**چەقۆی گەورە:** سیکارد.

**چەقیان** (ئەردە.): چەقین.

**چەقێلە:** چەقالە، دارێکی دڕواوی پەلک سپییە بەژنێک بلند دەبێ بەریشی وەکوو بادامییە بەلاَن چکۆلەترە و ناوکەکەشی تالە و لە خوێدا پەروەردە دەکرێ، هی شیرینیشی هەیە.

**چەقی مەرگ:** بەهەزار حاڵ، لە فەرمانێکدا زۆر ماندوو بوون.

**چەقیان** (ئەردە.): چەقین، تێڕاچوون.

**چەقێن:** چرچک، دەقەل، ڕەقانی زەوی، کرێن، چکڵ، (باک.) قەراچ، زەوی ڕەقەن، پارچە زەوییێکە پڕ لە وورده بەردو خیز بێ دەغڵ ودانی تێدا بێتێن و بلاَودەبێ.

**چەقین:** دامەزران، چەقان، داکوتران، ڕاوەستان، ڕۆچوونی چتێکی ڕەق لە چتێکی نەرمدا، تێڕا چوون، تێهەڵچەقین. لە قوڕی ـــ: واتە لە قوڕی ڕۆچوون. داکوتران، ڕاوەستان. جگێن، یاری میچێن.

**چەقێنە:** چەقەنەی ئاشی. چەقەنەی سمماکاران و شەکەرۆکان.

**چەقینەوە:** دووای بارانە، کە زەوی پەنەر بووە دەڵێن نێربۆتەوە و چەقیوەتەوە.

**چەقێنراو:** چەقاو، چەقیو.

**چەقیو:** چەقاو، چەقێنراو.

**چەک:** مرازی نێچیرو مرۆڤ کوژی و شەڕییە، یەرەق، داروبەرد. ـــ کردن: چەک لێ ئەستاندن. بە ـــ: چەکدار. بێ ـــ: بێیەرەق. (باد.، هەو.، ڕەوا.، هەورا.، باک.) خشڵ، زێڕ و زیوێکە ژنان بۆ جوانی بە خۆیانی دادەکەن. ڕووت، قووت، ڕووتەڵە، قووتەڵە. فەرمانی فەرمانڕەوا. چەکاڵ، کەوشی چەک. مەردومی ڕووت وقووت. پینەیەکی باریکە لە لایەکی پێلاَوی دەدروێ بۆ ڕاستکردنەوەی. چەرمی پاژنەی کلاشییە. (ڕۆژ.) چەقە، چەقاڵتە. قاقەزێکی چاپکراوی تایبەتییە لە بانکاندا بە پارە دەگۆڕێتەوە، قەبالە. قانگڵبەن، گڵۆڵبەن، نووالەیەک لە ئاوریشمی ڕەشی خاو. داروبەرد. چەکاڵ، قۆندەرەو کەوشی پشت پانیە شکاو. چەکەی هەلاجی. شڕ، دارزاو، دارزیاگ، کۆنە.

چەک

**چەکال** (باد.): قۆندەرەو کەوشی پشت پانیە شکاو. چەک.

**چەکاڵ** (خۆ.): چرچ و سیس، چەکلەر، گۆشت لەڕو پیس.

**چەکان:** نەمانی شیر لە مەمک یا لە گواندا. *

**چەکاندن:** زۆر مژینی مەمک لە لایەن ساواوە. (ڕۆژ.) شیر لە مەمکی بە دژواری هاتن، مژینی گوان و مەمک، چڵپانن. (باک.) چەکدارکردن، پڕچەککردن، ئامادەکردن.

**چەکانن:** چەکاندن.

**چەکە** (کۆ.): پارچەپینەیەکە، کە لە لایەکی ژێر پانیە بدرێ نەک لە تەواوی. پشتەکەواو ئیتر. (ڕۆژ.) کوتکی هەلاجی. (موک.) ماشەری ئاوریشمی. (شار.) مرۆی ڕووتەڵەونابووت.

**چەکەچەک** (موک.): چەپەچەپ، تەپەتەپ، پێلاَو بە چەکەچەک لە دووی خۆ کێشان. (ڕۆژ.) چتی قورس بەسەرنجکێشان.

**چەکەرە:** چتێکی سپی و گرنج گرنجە وەکوو شەکر لە سەر باستووق و دۆشاوو ئیترەوە بە هۆی کۆنی پەیدا دەبێ. (بابا.) چەقەرە، (کۆ.) چەکەرەک، چووزەڵە، گۆپکە، چرۆی دار، کەلە پێش گەلاَکردنی درەختاندا دەری دەکات و دووایە دەبێتە گەلاَ. (بابا.) نۆبەرەبۆ منداڵ و چتی تر. (کۆ.) خۆ ڕاگر. ـــ ناکا: خۆ ڕا ناگرێ.

**چەکەرەشکێن:** هەڵگێڕانەوە و کێلاَنی زەوییە بۆ جاری دووەم تا بە هێزبێ.

**چەکەرەکردن:** سەوز بوون و سەردەرهێنانی گژوگیاو درەختان. پەیدابوونی چتێکی سپییە وەکوو شەکر لەسەر باسووق و هەنجیر بەهۆی مانەوەیانەوە. دوودڵی، دوودڵبوون.

**چەکەرە کێشان:** چووزە کێشان، چووزەڵە دەرکردن.

**چەکەرە هێنان:** چەکەرەکردن.

**چەکەرداسی:** مرۆی زەبەلاحی شرپ و شۆڕ.

**چەکەوور:** بۆ چرووک لە بەر سووتانی نیسک یا ڕۆن.

**چەکبەردەچەکبەردە:** بە گیر هێنان و بگرەو بەردە. دارا و فەرەیدوون دوێنێ، ـــ یێکیان بوو کەس نەی بینیێ.

**چەکبەند** (زا.): بالاَپۆشێکی قۆڵ کورتە بە سەرشان دادەدرێت و قۆڵی تێهەڵناکێشرێ، (باک.): چەکبەست، چەکساز، چەک چێکەر، کارگەی چەک.

**چەکبەندی** (باک.): چەک لە خۆدان، خۆچەکدارکردن، چەکسازی.

**چەکچەکۆڵە** (زا.، دهۆ.): چەکچەکیلە.

**چەکچەکیلە:** شەقشەقۆک، شەمشەمەکوێرە، (زا.، دهۆ.) چەکچەکۆڵە، شەمشەڵەکوێرە، (باک.) پارچمک، چلیجیلی.

چەکچەکیلە

**چەکچن:** چەکچین، کەسێکە چەک لەم یا لەو دابڕنێ.

**چەکخانە:** جبەخانە.

**چەکدار:** پڕچەک، چارچەک، بەچەک. ـــ کردن: چەکاندن. ـــ ی: پڕچەکی، بەچەکی.

**چەکدەرو:** کەسێکە فەرمانڕەوا بە تاوانباری بڕیاری لە سەردابێ.

**چەکر** (هەورا.): کرێن، چەقێن.

**چەکساز:** (باک.) چەکبەند، چەک چێکەر. ـــ ی: چەکبەندی، چەکچێکەر.

**چەکلەر:** گیان لەبەرێکە لەبەر نەخۆشی ئێگجار ڕەق و لەڕولاواز بوویێ، چەکان.

**چەکم** (باک.): کیسەی چەرمە گۆشتی تێدا هەڵدەگیرێ.

**چەکمە:** شەلپە، ملالە، (هەو.) جزمە، چزمە، (هەورا.) مارنەگەز، پێلاَوێکی چەرمی لاسک درێژە لەکاتی قوڕ و چڵپاوێدا لە پێدەکرێت.

**چەکمەبوون:** زۆر سووتانی شوێنێک لە ئەندام و داماڵرانی پێستەکەی. فەرهاد دەستی واسوتاوە، چەکمە بووە.

**چەکمەرەق** (کە.): ئاغایـا کوڕێخایـەکی لێکـەوتووە، کـە هێشتا ئارەزووی ڕاوو سوواری بکات.

**چەکناس:** کەسێکە لە چەکاندا شارەزا بێ. ــ ی: شارەزایی چەکان.

**چەکۆ** (باد.): نێوی نێرینانە.

**چەکوپووش** (ئەردە.): شرەی ناوماڵ، شرەوپرە.

**چەکوچ:** مێکوت، زەنپ، زەنت، نقوورە، چـەکوش، چـەکوچی دووسـەرە: کاشۆ، ــ ی قەندی: قەندشکێن، شەکر شکێن.

**چەکوچردان:** مژینی مەمک بە چەشنێک، کە هیچی تێدا نەمێنێ.

**چەکوش** (ڕۆژ.، هەورا.): چەکوچ، ئاسنێکە دەسکێکی دار یا ئاسنی تێدەخرێ بزمار و چتی تری پێدا دەکوترێ.

**چەکوشکاری:** بەچەکوچ کارکردن.

**چەکوش مسگەری:** گەزینە.

**چەک وکەوان:** مشتەوکەوانی پـەڕەکاری (هەللاجی) کوتـک و کـەوانی پەڕەکەری.

**چەک ولووت:** پاژنەولووت، هی کەلاش و ئیتر.

**چەکیلە** (کۆ.): چەکچەکیلە، (کۆ.) شەمشـەمە، شەمشـەمەکوێرە. کیفی ئـەندامی کەنگرییـە وەکـو لوولـە و بۆڕی وایە و زۆر قایمە، هـەموو کەنگرێکیش نیەتی، (کۆ.) شەکیلە.

**چەگڵ** (هەو.): ووردەبەردی درشت.

**چەگناس** (باک.): پاشبین، دووربین، پاشەڕۆژبین. ــ ی: پاشەڕۆژبینی، لەدوواڕۆژ ووردبوونەوە.

**چەل** (ڕەوا.): هەژار، تەمبەڵ، چەلومەل، تۆق بەسەر ملەوە. دان، گـەر، وەهلە، جار، هـەل، حـەل، کـەڕەت، نۆبـە، چەلـە. نـۆرە دانـەوەی گەمـە بەوکەسـەی، کـە دۆڕاندوویـەتی. (هـەورا.) ڕووت. ــ کـردن: بـەزۆر ڕووتکردنەوە. (باک.) چل (٤٠).

**چەلابە:** ڕاولەسەربەفری.

**چەلاخ** (ئەردە.): چالاخ، ئەسپی بزۆزو بزێو.

**چەلاق** (باک.): سەرسەری، زۆربلێ، چەنەباز.

**چەلاک** (ڕەوا.): چالاک، شۆخ، شەنگ.

**چـەلاک** (ڕەوا.): چـەلاک، دووفیـچ. دارێکـی درێـژە و سـەری دوو فلیقانەیـە، مـازوو و گووێـزو چـتی تـری پـێ لـە داری بلنـد دەکەنـەوە دەیتـەکێنی، (خۆ.) چەرەگـە، تێـلا، (کـە.، خـۆ.) چۆلانـک، (شـار.) چەلانک، چلێ، قەلانک، قەلانگە، (هەو.) چۆلاک، گەلـەندۆر، چلاک، چلەک، چەلامکە.

**چەلاکـە:** قـەلانک، دارێکـی درێـژە، سـەرەکەی قولاپـەدارە بـۆ هـەنار لێکردنەوەو مێوەی تر بەکاردەبرێ. چەلاک.

**چەلان:** پاشبەندەکەی (ان) بۆگەلـە، دوو یا سێ یا چوار جاران. جاران، سەردەمی پێشوو، چەنانی پێشوو.

**چەلاندن:** چەڕاندن، لەوەڕاندن.

**چەلانگ:** چەلاک.

**چەڵاو** (کۆ.، بار.، ڕەوا.): چلاو، گۆشتاو، ناوی سەروپێ.

**چەلە:** چەل، نۆبە، نۆرە، کەڕەت. (ڕۆژ.، باک.) چلەی زستانی لـە ١٠ ی دیسەمبرێ تا ٢٠ ی کانوونی دووەم. ــ ی هاوینیش لە ١٠ ی تەمووز تا ٢٠ ی ئاب. (لو.) گوریس، نۆرەکایە لە یاریدا: ئەمجارە ــ ی منە.

**چەڵە:** دارێکی وایە چەڵـمـە لـە شـەغرەدا بـەکاردەبرێت بـە بـاوەش دەغڵی درواوی لـە تەنیشـتی بـەرز دەکرێتـەوە بۆ ئەوەی، کە لـە پاشـان جـەڕەب بدرێ، (دووش) پشی پێدەڵێن. (کۆ.) ئێسکی چۆڵە مێشکینەیە.

**چەڵـەب:** ناسک، جووان، ئەوکەسـەیە، کـە ئـاژاڵ و ڕەشـە ووڵاغ و ئـیتر بکرێ وبە جەڵەب بیباتە شارانی دوورو نزیک بۆ فرۆشتنەوەی.

**چەلەپایی:** جوورە هەڵپەڕینێکە.

**چەلەچەپک** (باک.): بە ــ چوون: خوشین.

**چەڵەچەڵ** (کە.، کۆ.): چەڵتەچەڵت، چەقەچەق، زۆر کوتنی چتی بێواتا.

**چەلـەحان** (ئـەردە.): دەسـتخوازی، داوای نۆبـە گەمـەکردن، داوای دەستکردن.

**چەڵەزین** (بار.): لەبندارانداندا لە چتێکی گەڕان.

**چەڵەک** (باد.): ڕەوان، ڕەهوان.

**چەلەکەنزەلێن:** حەنزەلێن، چەلەکەنزەل.

**چەلـەکورە** (هـەورا.): باڵندەیێکـە ڕاوکـەرە گۆشـتخۆرە لـە باشـووی گچکەترە.

**چەلەکی** (باک.): جوورە ماسییەکە.

**چەلەگە** (هەو.): ستوندە، ئەستونده، ئەستوندەی دەوار و قایەی مێـوان و ئیترە.

**چەلەم:** پیس و پەڵۆس، پێسکێر.

**چەڵەم** (هەورا.): هێچـک، (شارە.) چاکڵ، تەپەی جۆلایی. چەڵـمـە، چاکڵە، چاکڵ، کەڵەم، کەڵـمـە، چەمـەر، چەمـەرە، چەڵـمـەی دارینـە لـە ملی گایان دەکرێت.

**چەڵمە:** (هەورا.) قوولکەی شانیە. ئێسکی چۆڵە مێشکێنەی باڵندانە، بە ئێسکە دوو فلیقانەکەی سەرشانیش دەڵێن، کە بە مـلـەوە نووسـاوە وەکوو هی چۆڵە مێشکێنەو لە بەر سینگی باڵندەدایە، چاکڵ. تەنگانە، سەخلەتی، کێشەکێش، سەخڵەتی: کەس تووشی ــ نەیـەت. چەڵـەم، چاکڵە، چاکڵ، کەڵەم، چەمەرەیێکی وایە لە ملی گایان دەکرێت.

**چەڵمەشکاندن:** گرەوی چۆڵەمێشکێنەکردن.

**چەڵمەشکانێ** (ئەردە.): چۆڵـە مێشـکێنە، چەڵمەشـکێنە بـۆ تـاقی کردنەوەی یاد وگرێو بەشکاندنی (چەڵمە)ی باڵندانە.

**چەڵمەشکێنە** (هەورا.): چۆڵەمێشکێنە.

**چەڵمەگوریس:** (ئەردە.) چاکڵە.

**چەلەنگ:** جووان، شۆخ وشەنگ، کۆک، پۆشتە، لەنجەولار. (باک.، موک.) چالاک، توندوتۆڵ، ئازا، پاڵەوان، سووک، گەرناس، ژیهاتی. ــ ی نـەفتی و ئیتر: شکەڤ، شکەڤک، بـەرمیلی نەفتییـە. تـەنگ و چەڵـمـە، تەنگانەیێکی سەخت. (باک.) خۆش، تامخۆش.

**چەلەنگی:** جووانی، شۆخی، شەنگی، لەنجەولاری، ئازایی.

**چەڵەوان** (لو.): یاری چالێن.

**چەلپ** (باک.): چەلپک، چەلتک، دەنگی لێدان و کەوتن ولێخستن.

**چەلپاندن:** (باک.) چلْپاندن، بەزمان شلەمەنی خواردنی سەگییە. سەگەکە ماستەکەی چلْپاند: واتە لێیخوارد و پیسی کرد.

**چەلپزاندن** (باک.): واتا پووچ دەرچوون و نەتەقینی فیشەکە لەتفەنگ یا دەمانچەدا.

**چەلپک** (باک.): چەلْتووک.

**چەلْتاندن** (باک.): پێست لێکردنەوە. ڕقهەلْستاندن.

**چەلْتە** (باک.): جانتا. سازندەیی کردن، دووزمانی، زمانڕێژی چەنەبازی.

**چەلْتەچەلْت:** (ڕۆژ.) چەلْەچەلْ، چەنەچەنە، چەنەبازی بێپسانەوە. ـــ کردن: بێسوود چەنەلێدان.

**چەلتک** (باک.): چەلْتووک، جەوالّی گچکە.

**چەلْتک:** چەلْتووک.

**چەلْتووک:** چەلْتک، چەلپ، (باک.) چەلپک، چلتووک، برنجێکە لە ناو کیفەکەی خۆی دابێ و نەکوتراوو پاک نەکراو. گیای برنجی، ساپ.

**چەلْتووک تێفرێدان:** مەبەس لە دووانی خراپە لە کاری ئەم و ئەودا.

**چەلْتووکجاڕ:** مەرەزەجار، جارە مەرەزە، (ئەردە.) شالْیگا.

**چەلتین** (باک.): کەولْکران، پێست لێکرانەوە. (باک.) ڕقهەلْستان.

**چەلچەلە:** جارجارە، تاوتاوە، ناوەناوە.

**چەلخوو** (چەلغوو): گەسکێکە لەلکی داران بۆ خەرمانان بەکاردەبرێ.

**چەلْخووس:** فەریک.

**چەلْخووسی جۆێ:** چەقەلووس، کولین جۆ، جۆی فەریک بپرووێنرێ و بۆ درێ و لە دەستاڕکرێ و لەگەلْ گۆشتی بەپلاوی لێنرێ بە پلاوەکەشی هەردەلْێن ـــ، کە تامێکی زۆر خۆش و نایابی هەیە.

**چەلْخووسی گەنمی:** گەنمی فەریک لە نێو ئاوی گەرم دەنرێ تا چەند خولەکێکی و دوایە لە بەر هەتاوی ووشک دەکرێتەوە و دەپروێنرێ و لە دەستاڕی دەکرێ و بۆ دۆلْمە و پلاو بە کاردەبرێ، هەر چێشتێکی پێی لێنرێ بە تایبەتی پلاو پێی دەلْێن ـــ .

**چەلغوو:** چەلخوو.

**چەلقاندن:** (باک.) چەلکاندن، جوولاّندن، بزواندن، دەنگی شەپۆلانە.

**چەلقین** (باک.): جوولاّن، بزووتن.

**چەلکاندن** (باک.): جوولاّندن، بزاوتن.

**چەلکین** (باک.): جوولاّن، بزووتن.

**چەلم** (ڕۆژ.): بونیە. لەڕ، لاواز، باریک.

**چەلْماس** (کە.، لو.): نەوسن، چاوچنۆک، چلْێس.

**چەلْمسک** (لو.): چلْێس، نەوسن، چاوچنۆک.

**چەللاندن** (باک.): وەقسەخستن.

**چەلین**(باک.): ئاخەفتن.

**چەلوچۆم بوونەوە:** پەلاماردان.

**چەلووز:** دەرزەکەری نووزە درێژ.

**چەل و مەل:** چلومەل، چۆلەکولکی داری.

**چەل و مل:** پیلْۆس، مەلاّس، مێمل، کەسێکە، کە بووبی بە سەربار بەسەرشانەوە.

**چەلْی** (هەورا.): گیایەکە گەلاّی وەکوو دەرزی باریک و نووک درێژ و تیژە، گیادەرزیلە.

**چەلی** (زا.): ووشەیەکە ڕەشەوولاّخی پێ لێدەخوڕن.

**چەلیپ** (باک.): خاچ، چەلیپا.

**چەلیپا** (کە.، ڕۆژ.): خاچ، ڕاست و چەپ، چتی ڕاست و چەپ.

**چەلیپایی** (کە.، ڕۆژ.): خاچپەرست.

**چەلێک حەنزەل:** حەنزەل، حەنزەلین.

**چەلێن:** گەمەیێکی منداڵانە.

**چەلین:** گۆرەوی ڕەنگاورەنگ.

**چەم** (هەورا.، ڕۆژ.): چاو، دیدە. ـــ بەرەژێر: چاو بەرە ژێر. (باد.، باک.، هەورا.) ڕووبار، چۆم، چۆمێکە دارو باری هەبێ. (باک.) زێ، لە چۆم گەورەترە. (ڕەوا.، دەر.، سۆر.، هەورا.، جا.، شار.، بابا.، کە.، سن.) چۆم، ڕووبار،(ئەردە.) ڕووخانە، چوخوڕ. (فە.) دۆلْ وەدەرەیە، کە دارستان و بێشە و باغاتی زۆر بێ. شینایێکە لە کەنار ئاواندا ڕسکابێ. (باک.) گۆچانی چەماوەوە، خەم، کووڕ، کۆم، چەمیاگ، (ئەردە.) چنەگ، چتی چەماوەوە. واتا، مانا، ناوەڕۆک.

**چەما:** چما، چمان، دەلْێی، واگومان دەکەی.

**چەم ئاخورە** (ئەردە.): پەرژین، تەیان.

**چەمارۆ** (بلْ.، کۆ.، خۆ.): گەمارۆ، پەلاماری سەگانە بۆ هەر چتێکی بێ. (هەورا.) پشێوی، شلووقی.

**چەماش** (هەورا.): چەمووش.

**چەمال** (باک.): خەمخۆری، دلْسۆزی.

**چەمان** (هەورا.): خوواربوونەوە، چەوتان، چمان، داهاتن، چەمیان. بزنێکی ڕەش و سپی بێ، بەلْەک.

**چەمانەوە** (هەورا.): خوواربوونەوە، کووڕبوونەوە، داهاتنەوە، قوولزین، داچەمین، چەمینەوە، چۆمانەوە، داچەمان، چەوتان، چقکرن، کۆمانەوە. (خۆ.) قەرانگەکردن.

**چەماندن:** چەماندنەوە.

**چەماندنەوە:** داهێنانەوە، قولْزاندن، چۆماندنەوە، قەوچاندنەوە، خووارکردنەوە، کووڕکردنەوە، کۆمکردنەوە، بەرقەکرن، چەوماندنەوە، خۆ ـــ: دابوون.

**چەمانن:** چەماندن.

**چەماننەوە:** چەماندنەوە.

**چەماو:** کووڕ، خووز، داهاتوو، چلووچووف، کۆم،(باک.) قۆف، پشتقۆف. چەم، چۆم، ئاوی چۆم.

**چەماوە:** چەمیلە، ترۆزی.

**چەماوەوە:** کووڕبووەوە، خووار بووەوە، چەڤیای، چەمیو، داهاتوو.

**چەماوەوەیی:** کووڕی، چۆچک.

**چەم ئێشە** (هەورا.): چاوئێشە.

**چەمە** (ئەردە.): کەمە، چەماوەوەیی. (هەورا.) چاوە، سەرچاوە، کانی. (هەورا.) چەمەر، کەوە، کەمەی هێلەگ وسەرەند و بێژنگ و نیتر. (ئەردە.) چاوگەیێ لە خانوو یا کەپر، دیو، ژوور، چاوە.

**چەمەدان**: باوڵ. ــ ی: باوڵی.

**چەمەر** (موک.، هەورا.، دزە.): کۆتەڵ، چەمبەر، شیوەن و گریان بۆ مردوو بە کۆمەڵی، چەمەرە، زێوەکردن، کۆمەڵەگرتن، کۆمەڵەی پیاو و ژنانە بە دەورەی تەرمەوە بەشین و گابۆر، بۆ (تووک) یش بەکاردەبرێ: یاخودابە ــ بێ. جاران، کە کەسێکی گەورە یا خۆشەویست بمردایە جل و بەرگ و چەکی بە سەرزینی ئەسپەکەیدا دەکراو بە دەوری ئاواییدا دەیانگێڕاو دانیشتوانی ئاوایی بە گریانەوە بە دەورەیدا دەرۆیشتن، چەڵەم.

**چەمەرانە**: دەهۆڵ و زورنایە، کە بە بۆنەی شیوەن و چەمەرەلێ بدرێ، جوورە شیوەنێکی دوودەستەییە دەستەییێک پیاوو دەستەییێکیش ژن بە پێوە وەک ئاڵقە چەمەرە دەبەستن بۆ شیوەن کردن.

**چەمەڕای** (هەورا.): چاوەڕێ.

**چەمەرە**: ئاڵقە، دایرە، هاڵە، ئاخڵە. ئاڵقەییێکە بەنێڵەوە سەری مژانەی بە ناودا دەچێت. (کە.، دەر.) چەمبەرە، چەمبەرەی شەغرەی داری چەماوەوە، دارێکە بە تەڕی داهێنرابێتەوە بە جوورێکی وا، کە هەردووک سەری گەیشتبێتەوە یەکتری بۆ هەموو چێتێکیش بەکار دەبرێ، کە وەکوو ئاڵقە وابێ. (ڕۆژ.) ئاڵقەدارێکە لە نیری دەکرێ سەری ئامورەکەی دەچێتە نێوەوە دووایە هەپەی تێدەکوترێ تانەیەتە دەرێ، بۆسە.

**چەمەرەخەیار**: ترێزوو، تەرۆزی.

**چەمەرجۆیی**: هەڵپەرین بە کۆمەڵ بەدەم گریان و شیوەنەوە.

**چەمەری** (ئەردە.): دەهۆڵێکە بۆ شیوەن لێبدرێ.

**چەمەزەخم** (هەورا.): چاوزار. (هەورا.) کەللەی کەر یا وولاخێکییە بۆ چاووزار لە ناو بێستاناندا بە داریدا دەکرێ.

**چەمەسیوڵە** (هەورا.): قەیتەران، پەلی سیاوەشان، خاڵەرەش، گیایەکە گەڵای وەکوو کەرەوز و ساقی باریک وزۆر ڕەشە لە بن کاج و قەڵبەزدا دەردێت بۆ خارشت زۆر باشە.

**چەمەشا**: چەمووش، سرک.*

**چەمەقووڵە** (هەورا.): چاوقووڵکە.

**چەمەن**: چیمەن، مێرگ.

**چەمەنەمای** (هەورا.): چاوداهاتن.

**چەمەنتۆ**: چیمەنتۆ.

**چەمەنزار**: چیمەنزار.

**چەمبەر**: چەمەر.

**چەمبەرە**: چەمەرەی شەغرەی، داری چەماوەوەیە. چوار چێوە، پەرواز.

**چەمبرسی** (هەورا.): چاوبرسی. ــ تی: چاوبرسێتی.

**چەمبڕیای** (هەورا.): چاولێکەری.

**چەمبل** (باک.): ئاڵقە، هەنگڵ، قوڵف، دەسک، دەستە، قوڵفی دیزە و گۆزە. (باک.) گەر، ئاودر، تەنگە، دراف، ئاڤدرگە.

**چەمبلوولک** (باک.): پلووسک.

**چەمبۆڵە** (شا.): چەمۆڵە.

**چەمپاڵ** (زا.): سەربار.

**چەمپل** (باک.): باسک، دەست لەسەری قامکانەوە تابنهەنگڵ.

**چەمتاوە**: چەماوە.

**چەمتەنگ** (فە.): بەرچاوتەنگ.

**چەمچ** (باک.): چەوچ، کەوچک، جوورە کەوچکێکە، ئاوخۆرە، بادەی ئاو خوواردنەوەیە.

**چەمچە** (هەورا.): کەوچک، چەمچک.

**چەمچەچای**: کەوچکی چای.

**چەمچەماڵ**: شارۆچکەیەکی گچکەیە لە گەرمێنیدا کەوتۆتە نێوانی کەرکووک و سلێمانییەوە.

**چەمچک** (باک.): خێل. کەوچک.

**چەمچۆچای** (هەورا.): کەوچکی چای.

**چەمچۆڕ** (ڕەوا.): مرۆی لەڕولاواز و پیر.

**چەمچوور** (باک.): زیندەوار و ئاهۆیەکە تووشی تووتن و دارە مێوێ دەبێ گۆیا جوورە مێشێکی گەورەیە، کە تووڵە ناسکەکانی میوەی بگەزێ ووشکی دەکات.

**چەمچی** (زاخ.): چەرچی، کەسێکە سەودا و کڕین و فرۆشتنی سەرپێیی بکات.

**چەمچیر** (باک.): جوورە ترێییەکە، ترێ ڕەشکە، مێلووی منداڵ.

**چەمڕەشک** (باک.): گیایەکە.

**چەمزەق** (هەورا.): چاوزەق.

**چەمساخ** (هەورا.): چاوساخ. ــ ی: چاوساخی.

**چەمسووتەکە** (کە.): جوورە چێشتێکە لە ترخێنە دروست دەکرێ، چێشتی ترخێنە، چەنسووتەکە.

**چەمک** (باک.): داردەست، گۆچان. واتا، مەبەست، مانا. قەوورخە، قەراخ، کەنار.

**چەمکز** (هەورا.): چاوکز. ــ ی: چاوکزی.

**چەمل** (باک.): هەنگڵ، قوڵفی دیزەو گۆزە.

**چەمڵە** (هەورا.): چاو.

**چەم و چوخمۆ** (ئەردە.): چەم و چوغورد.

**چەم و چوخورد** (ئەردە.): شیو و دۆڵێکە، کە زۆر زەبەند و چرپێ.

**چەموچەغورە** (ئەردە.): ڕووبار، چۆم، دەرە.

**چەم و خەم** (ئەردە.): نازونووز، چەم.

**چەمۆش**: (هەورا.) چەمووش، شەمۆز، جوهیم، زنجک، ناڕاس، نەگوهدار، چالاخ، وولاخێکە ساهی باری یا سوواری بێ بزۆز و سەرکێش بێ و لووشکان باوێت و پشت نەدات.

**چەمووش**: گیانداری سرک. (هەورا.) چەماشا، سرک، چەمۆش، بارنەبەری چەتوون، بۆ وولاخی بەرزە بەکاردەبرێ.

**چەمۆک** (باک.): جۆگە.

**چەمۆڵە**: چەپۆڵە، (کۆ.) چنبۆڵە، (ڕەوا.) کژکە، پووک، (جا.، هەورا.) پۆکەلاو، (شا.) گشکە، چەمبۆڵە، (هەو.، کۆ.) گشکە، چەپاڵە، چەموڕڵە، پووک. ــ لێنان: ئم لێکردن، خشەپێگرتن، چەپاڵەدان.

**ڕشكه** (باک.): هەرشتە.

**ڕشكدار**: ڕشكن. ـــ ی: ڕشكنی.

**ڕشكن**: ڕشكدار، بەڕشک، ڕشكاوی، كەسێكە زۆر ڕشكی لە پۆشاكیدابێ.

**ڕشمە** (باک.): هەمموو ئەندامێكی گومبەزییە. نیری جووتی یە. ڕەشمە. خشڵی ژنان.

**ڕشنا** (فە.): ڕووناک. ـــ هی: ڕووناكی.

**ڕشوان**: ئێلێكی گەورەی كوردە.

**ڕشیایۆ**: ڕشانەوە.

**ڕشێن**: ئاپڕژێنكار، كەسێكە نانی ڕەق بڕشێنێ بۆ نەرم كردنەوە.

**ڕشێنە**: بارانێكی زۆر سووكە، كە تەنها ئاپڕژێنی زەوی بكات لەسەرەخۆ.

**ڕشێنەر**: ڕشێن.

**ڕشێنەوە**: دەرمانی ڕشانەوە، دەرمانێكە مرۆی بڕشێنێتەوە.

**ڕف**: دیراوێكی درێژە لە قەراخ زێیەدا بۆ ترێزوو. (كە.) زۆیرین و كۆڵین بە بێڵ. ـــ لێدان: بێڵ باش لە زەوی دا گرتنە خوارەوەیە. ـــ لێدە: بێڵەكەت باش بە زەویدا ڕۆبە خوارێ.

**ڕفاندن**: ڕاڕفاندن، ڕاونان، ڕەپێ نان، هەڵانن، ڕەڤاندن، (باک.) ڕەواندن. (هەورا.) ئەرفای، (هەو.) قەپاندن، چرسانن، ترافانن، پەلاماردانی چتێک و بردنی بە دەست و برد.

**ڕفانن**: ڕفاندن.

**ڕفە**: ڕفحە.

**ڕفت** (باک.): باریک وناسک.

**ڕفتن**: درین، ڕێگا كردنەوەی ئاوێ یە.

**ڕفت و ڕێژ** (ئەردە.): ڕیان و میزتن.

**ڕفحە**: (هەورا.) ڕەفە، (هەو.) تاخچە، (هەو.) ڕفكە، (بابا.) ڕفە، تاقەیێكی بڵندە لە نێو دیواری ژووراندا بۆ چت لەسەر دانانی.

**ڕفسە** (دەر.): ڕەوسە، جۆخین سوور، خەرمان.

**ڕفک** (شێخ.): سەمەنئۆک.

**ڕفكە** (خۆ.): حەوزی ئاوێیە.

**ڕفۆک** (هەو.): پسووخ، چتێكە ڕزیبێ و هەڵبوەرێ، كەندالێكە لێوارەكەی لەبەر ڕزیوی هەر لە خۆڕا بڕووخێ.

**ڕفیاگ**: فڕێنراو.

**ڕفیدە**: (هەر. هەورا.) مادە، مەزرەكە.

**ڕفێن**: ڕفێنەر، قەپێن، ئەو كەسەیە چتی بڕفێنێ. ڕاونەر، ڕەپێنەر، ڕاڕفێنەر.

**ڕفێنەر**: ڕفێن، قەپێن، ئەوكەسەیە، كە چتی بڕفێنێ.

**ڕفێندران**: فڕێندران.

**ڕفێنراو**: ڕاونراو.

**ڕفێنراو**: تیژهەڵگیراو.

**ڕفین**: ڕووخان، ڕمانی بەرد و چیا و سەربان دیوار و نیتر، (هەورا.) وورین.

**ڕڤین**: فڕین، باڵگرتن. (باک.) گر، ڕووناک. ـــ ی: ڕووناكی.

**ڕق**: وورک، نگە، گجگ، عنجک، كینە، كووڤان، ئەرناڤ، پیش، پشم، ڕۆڤ، ڕژڤک، قین، كین، ڕک، دەخەز، ماد، ئەرن، پرووشە، كەرب، جەنە، غەید، توندی، تووڕەیی. بە ـــ : ڕقدار، مەڕس، دڵپڕ.

**ڕقا** (باک.): شارێكی كوردانە لەسەر چۆمی فوراتێ لە هێلا جزیرێیە هەر وەكوو لەناوشاریدا كورد هەن لە باكووری وێش كورد زۆرن.

**ڕقارک** (باک.): ڕەقەڕەق.

**ڕقاوی**: ڕق ئەستوور.

**ڕقەئەستوور**: دڵتاریک، دڵپڕ، دەخەزدار، (باک.) بێ بەزەیی، ئەرنۆ، كینۆ. ـــ ی: دڵپڕی: دەخەزداری.

**ڕقەبەری**: پالوو، بەربەرەكانی، ڕكەبەری، قینەبەری، لەگەڵ یەكتری بەرەنگار بوون، لەداخی یەكتری كارێک یا ڕێگایەک خستنەبەر. ـــ كردن: بەربەرەكانی كردن.

**ڕقەستوور**: ڕقن، ڕكن، قیندار. ـــ ی: ڕقداری، قینداری.

**ڕقكێشان**: ڕق هەڵگرتن لەدڵدا بەرانبەری یەكێكی.

**ڕق جوونەوە**: لەسەر ڕق ڕۆیشتن.

**ڕق جووین**: ڕق جوونەوە.

**ڕقخواردنەوە**: پیشخواردنەوە، ددان بە جەرگی خۆداگرتن و پشت لە ڕق كردن و گوێ پێنەدانی لەكاتی ڕق هەستانێدا.

**ڕقدار**: غەیدۆک، نەهارەزگ، دڵپڕ، قیندار، مەڕس، ڕق ئەستوور. ـــ بوون: دڵپڕبوون، قینداربوون. ـــ كردن: دڵپڕكردن، مەڕسكردن.

**ڕقرقۆک**: خرەخڕ و خشەخشی كالای تازە. (باک.) ڕپاڕپ، تەقەتەق، قرچەقرچی شكانی دارو نیتر. ووشک.

**ڕق گرتن**: تووڕەبوون، جەنەگرتن، قین هەستان و دانەمركانەوەی مرۆ.

**ڕق لەزگ**: كەسێكە ڕقی لەدڵیدابێ.

**ڕق لەسک**: ڕق لە زگ.

**ڕق لێكێشان**: ڕقەبەری كردن لەگەڵ یەكێكی.

**ڕق لێهەڵگرتن**: وەزگدان، ڕق لە دڵ گرتن لە یەكێک بۆ تۆڵە لێكردنەوەی لەدەرفەتێكیدا.

**ڕقن**: ڕق ئەستوور، ڕقاوی.

**ڕق نیشتنەوە**: (باک.) بەنجین، ئەرناڤ لێچوون.

**ڕق هەستان**: ڕق هەڵستان، توند و تووڕە بوون.

**ڕق هەستاندن**: ڕق هەڵستاندن.

**ڕق هەڵسان**: ڕق هەڵستان.

**ڕق هەڵساندن**: ڕق هەڵستاندن.

**ڕق هەڵستان**: چەلتین، خەزرین، هەڵترین، قینەوەهاتن، گەوی، ڕكاهەلانین.

**ڕق هەڵستاندن**: بۆنگ كرن، مادكردن، چەلتاندن، ڕق هەستاندن، ڕق هەڵساندن، (باک.) بەنجادن، شەق پێبردن.

**ڕک** (ئەهە.): جێگای هەوراز و لێژ وسەخت. گوریسێكی درێژی پڕ ئاڵقەكراوە سەری بەرخ و كاریلان دەئاڵقەكان دەكرێت تادایكیان نەمژن یا بۆ بەستنەوەیان یا بەنێكە لەملیان دەكرێ تانەمژن. (باک.) پێداگرتن،

بنار، هەتەر. (کە.) پەلّپ، بەهانە. ڕق، قین، ڕۆڤ، ڕۆڤک، پشم، جەنە، ـــ ا هەلانین: ڕقهەلّستاندن.

**ڕکابەری:** ڕقەبەری.

**ڕکان** (کە.): زنجیرەی بەردان و کێوان. (باک.) بنار، هەتەر، پێداگرتن. (کە.) زنجیرەی بەردان و کێوان.

**ڕکە** (هەورا.): جنە، قینەهووڵ، (هەورا.) ڕێگایەکە تووشبێ و سەخت، (ڕەوا.) هەورازی سەخت، لاپاڵی سەرو لێژ لە شاخ و گردانـدا، (ڕەوا.) قیسپی خانووان، نیشانەی نێرینەیە لەلاقی کەڵەباب و کەوی نێر و ئیتر دێت، ڕنە، پاشەڕنە، چوو، (ڕەوا.) قین، ڕق، ڕک. بنار، هەتەر، ڕکک، پێداگرتن. (ڕەوا.) ئالّوودار، (باک.، نەه.) قەفەز، ڕکەم، بێرکم، ڕکک.

**ڕکەبەرێتی:** ڕقەبەرێتی.

**ڕکەبەری:** ڕقەبەری، بەربەرەکانی.

**ڕکەل** (باک.): قەفەزەی سینگی گیانلەبەرانە.

**ڕکەرک:** بنار، هەتەر.

**ڕکەک** (باک.): ڕکەم، قەفەز.

**ڕکدابردن:** ڕقهەستان، ڕقگرتن.

**ڕکدار:** ڕقدار، دڵپڕ، قیندار. ـــ ی: قینداری، دڵپڕی.

**ڕکرک:** چیرەچیری ددانییە لەبەرنەخۆشی یا لە سەرمان.

**ڕکرکاندن** (باک.): لە سەرمان لەرزاندن.

**ڕکرکین** (باک.): لە سەرمان لەرزین.

**ڕککۆیی** (زا.): ڕق ئەستوور.

**ڕکگر:** ڕقدار، ڕقن، کیندار.

**ڕکگرتن:** ڕقداری.

**ڕکن** (باک.): بەردی گۆشەدار. (ئەردە.) ڕقدار، ڕقن: کیندار.

**ڕکو** (باک.): ڕکان، بنار، هەتەر.

**ڕکۆیی** (باک.): ڕکان، هەتەر.

**ڕکوو** (باک.): خووارایی قەدی دارانە.

**ڕکێب** (باک.): ڕکێف، ـــ ا تەدرێژبە: دەسترۆیشتوو بەختەوەربی.

**ڕکێشە:** ڕەکێشە گیایەکی گەلاّ پانی ڕەگ ڕەگاوییە بۆ برین و دومەلاّن باشە.

**ڕکێف:** ئاوزەنگی، ڕکێب، ڕکێو، پایە، شان وشکۆ، لەژێر ـــ دابوون: مل شۆڕکردن، ژێردەستی.

**ڕکێفداگرتن:** مەبەس لەغاردانی ئەسپانە.

**ڕکێف دەواڵ** (ئەردە.): قایشی ئاوزەنگی.

**ڕکێف دووالّ** (ئەردە.): قایشی ئاوزەنگی.

**ڕکێف کوت:** بەغار، بەپەلە، لەکاتی ئەسپ غاردانێدا.

**ڕکێو** (کە.): ڕکێف.

**ڕم** (باک.، کە.): ڕمب، نێزە. ڕمە، ڕمبە، تەپە، دەنگی پێی یەکسمان وپاکوتنی چتانە.

**ڕما** (ئەردە.): ڕووخا، کاولبوو.

**ڕمان:** (جوا.، فە.): ڕووخان، دارووخان، بەربوونەوە. (باک.) ڕووناکی وشۆقی ئاورییە، بڵێسە.

**ڕماندن:** (فە.، جا.، جوا.) ڕووخاندن، دارووخاندن، بەیەکادان.

**ڕمانن:** ڕووخاندن.

**ڕماو:** ڕووخاو.

**ڕمای** (هەورا.): ڕووخان.

**ڕمە:** ڕمبە، ڕمە.

**ڕمە** (خۆ.): سەهۆڵ. چلوورە.

**ڕمەڕم:** ڕمەڕمم، ڕمبەڕمب، دەنگێکە وەکووگرمە، تەپە.

**ڕمەڵ** (ئەردە.): کاووڕی، سەرگەردان، شێواو.

**ڕمب:** ڕم، دارێکی درێژی لووسی قەفقەفییە ئاسنێکی نووک تیژی لەسەری گیراوە مرازی شەڕێ بووە لەسەردەمی پێشوودا.

**ڕمباز:** ڕمب باز، کەسێکە بەڕمبی یاری بکا و لە وەشاندنیدا ڕام بێ.

**ڕمبازی:** ڕمب بازی، قۆشمە، غارغارێن کردن بەوولاّغ، یاری بەڕمب کردن، نێزەبازی.

**ڕمبە:** ڕپە، ڕپەڕپ، ڕمە، ڕمە، زرمە، تەپەیەکە لەکاتی کەوتنی چتێکی قورسدا دەبیسترێ بەوەدەنگەش دەڵێن کەبەسەربانانداغار بدەن.

**ڕمبەڕمب:** تەپەتەپ، زرمەزرم، ڕپەڕپ.

**ڕمبێز** (باک.): ڕێواس.

**ڕمبێژ** (باک.): تاوە.

**ڕمپێشک** (باک.): تاوە.

**ڕمچە:** (ئەردە.) کوڵەڕم، قولەڕمب، کورتەنیزە.

**ڕمدار** (ئەردە.): نێزەدار.

**ڕمڕم** (باک.): هەراهەرا، دەنگەدەنگ.

**ڕمڵ:** مۆرە، بەختناسی. (ئەردە.) زیخ، ڕێخ، ملت، ماسە.

**ڕمنای** (هەورا.): ڕووخاندن.

**ڕموودە:** هۆگر، ڕام.

**ڕمووزن:** (دەر.) حەز، ناشیرین، دزێو، حەنتیکە، ئێسک قورس.

**ڕمیاگ** (ئەردە.): ڕووخاو، ئارفتە.

**ڕمیان** (ئەردە.): ڕووخان، ڕووخیان، وێرانبوون.

**ڕمێلک** (باک.): باڵندەیەکە.

**ڕمێن:** بڕهو، هەڕمێن، ڕووخێن، وێرانکار، (باک.) هەراهەرا، دەنگەدەنگ، ڕمڕم.

**ڕمی:** (باک.) ڕووناکی، گڕ.

**ڕمین:** وێرانبوون، کاولبوون، ڕمان.

**ڕن** (باک.): دەنگی زەنگوڵە و چتی وایە، تن، تنک، ڕنگ، ڕنگە.

**ڕناو:** ناوی ڕنووان، بەفراو.

**ڕنە:** (مام.) حەیاس، ڕکە، چووە، نینۆکە درێژەکانی پشتەوەی دەستی مریشک و کەڵەبابانە کەتەمەنیان نیشاندەدات. (بابا.) ڕەندە، ئاسنێکی

دەم تیژە دارتاشان داری پێ لووس دەکەن. ڕەندەی پەنیری. (هەو.) گیایەکە نیو بەژن بڵند دەبێ و بەشلکی دەخورێ کەوروشک بوو دەیسووتێنن بۆ برینان باشە، وەڵکەڕنە. وورده بارانێکە، کە دەوار دایدەدات لەکاتی بارانەدا. ڕنینی باغ و چنینی بەری داروبار و ڕنینی گوڵی مەرەزە. (ئەردە.) باڕن.

**ڕنەر**: داڕن، خەرت لێدەر.

**ڕنەک**: ئاسنێکی درێژ کۆڵەی کولۆری دەدانە دەدانەیە وولاخی پێ پاک دەکرێتەوە، (موک.) ڕنەکی وولاخان، قەشاو. ــ کردن: شاڵ و قەشاوکردنی چارەوێ، (هەو.) نێرتکی کەنگرییە، (باک.) تۆزەک، (بابا.) ڕنک.

**ڕنەککردن**: بەڕنەکی پشتی چارەوێی پێخاوێن دەکرێتەوە وئەوسا شاڵ وقەشاودەکرێ.

**ڕنیاگ**: ڕنراو، ساهەر چتێکی بێ کە بڕنرێتەوە لەمیوە و گژو گیا، گەڵا، مێو، پێست.

**ڕند** (شکا.): جووان، ڕەند، شۆخ.

**ڕندە** (باک.): ڕەندە.

**ڕندەشە** (باک.): ڕەندە.

**ڕندەک** (باک.): ڕەندە.

**ڕندران**: ڕنران.

**ڕندراو**: ڕنراو، ڕیشالۆ.

**ڕندک**: فرمێسک.

**ڕندۆ** (باک.): ڕند، ڕەند.

**ڕندۆک** (باک.): ڕنوو.

**ڕندۆڵ** (سەق.): پرچک، پرتۆک. شیتاڵ، کۆنە، تیتڵە، تیتو، ڕندۆڵ، پارچەی شڕ.

**ڕندوو** (کە.): ڕندۆک، ڕنووەبەفر.

**ڕندێ**: ناوی ئافرەتانە، جووان، نازدار.

**ڕندێن** (خۆ.): ڕدێن، ڕیش.

**ڕندی** (باک.): باشی، ڕەندی.

**ڕنران**: شەرمخێن.

**ڕنراو**: ڕندراو، ڕیشالۆ.

**ڕنک** (هەو.): نێرتکی کەنگرییە، ڕنەک.

**ڕنگ** (بابا.): کران، کرە. (باک.) ڕەنگ، (بابا.) شیلەی خەستی بێ گرێ و گۆڵی شیرینی وەکوو هەنگووین و دۆشاوونیتر.

**ڕنگارنگ** (باک.): تەقەتەقی چەکانە.

**ڕنگاڵ**: شیلەی دۆشاوهەنگووین و نیتر. هەنگووین و دۆشاوی پوختی پاڵێوراو، ڕەواقی هەنگووینی، ڕینک.

**ڕنگانەوە**: چەند پاتەکردنەوەی ئاخەفتنێک.

**ڕنگاندن** (سل.): کراندن.

**ڕنگاو** (بابا.): سرکەیەکە، کە هێشووە ترێی ڕەشی تێخرابێ بۆخواردنی لەکاتی زستانێدا تا بەهارێ.

**ڕنگە** (بابا.): ڕەندەی دارتاشی.

**ڕنگەڕنگ**: پرتەپرت، بۆڵەبۆڵ، گۆتەگۆت.

ڕنۆک

**ڕنوو**: ڕنەوو، ڕەنوو، کەوی، ئاشیت، سافۆ، پاسارە، کەڤی، ڕەنی، (سەق.) کلێڵەبەفر، (باڵە.) کەپکەبەفر، ڕنی.

**ڕنۆک**: جنجڕۆک.

**ڕنووک**: کەل و پەلی تەونییە، مرازێکی تەونییە. چنگکورکی گیانلەبەرانە کەچتی پێ دەڕنرێ.

**ڕنی** (باڵە.): ڕنووەبەفر.

**ڕنیاگ** (ئەردە.): ڕنراو.

**ڕنیاگەوە**: ڕنراوەتەوە.

**ڕنیان**: ڕنران.

**ڕنیانەوە**: ڕنرانەوە.

**ڕنین**: ــ ی باغ و باخچە و سەوزیخانە. دارڕم، خشتکاندن، شەرمخاندن، ــ ی ئاسن یادار: کلاشین، لەخەرتدان، کراندن، خەرتاندن، بەنێنۆکی ــ: چنگوڕک لێدان، چەنگاڵ لێدان، ڕووشاندنی لەش بە نینۆک. ڕنینەوە.

**ڕنینەوە**: خوراندن، دروونەوەی گیاو خەڵە بەدەست: ــ ی باغ و باخچە: میوە و گژو گیا چنین .

**ڕنینەوەی خوری لەپشتی ئاژاڵان**: (باک.) بەرکرن، ئەرووچکاندن، داڕنین، ــ ی باڵندان: ئاوەڕووتکردن، پرچکاندن. (هەر.) بەچاوبەسەرکردنەوەی ئاژاڵان بەبێ بژاردن تا بزانن کێها ماوە یا نەماوە.

**ڕۆ**: ژنان لەکاتی خەم و خەفەتیدا بەکاردەبەن، ئاخ، داخ، ئەیڕۆ، ئایڕۆ، ڕۆڕۆ، بابەڕۆ، براڵەڕۆ، دایەڕۆ، شیوەن، گریان. (هەورا.) ڕۆژ. (زەن.) خۆر. (باک.) ڕۆژ، ڕووبار، پارچە خاکێکە، کەکشابێتە ناو دەریاوە، (ئەردە.) ڕوو، ڕوخسار، شێوە، دەموچاو.

**ڕۆئاوا** (باک.): ڕۆژاوا. ــ ی: (باک.، هەورا.) ڕۆژاوایی.

**ڕۆبار** (باک.): چۆم، ڕووبار، (باک.) ڕێبووار.

**ڕۆبنار**: ڕیی هەناری.

**ڕۆت** (هەورا.): ڕەوت، (باک.) شیشەی ئاسن، داری باریک و درێژ.

**ڕۆتەفتان** (ڕەوا.): ڕاوەستان، نەجووڵان، دامرکان، سرەوتن، (هەورا.) ڕاکەوەی، ڕۆتەفتین، ڕۆتفتان.

**ڕۆتەفتاندن**: دامرکاندن.

**ڕۆتەفتێن**: دامرکێن.

**ڕۆتەفتین**: سرەوتن، ڕۆتەفتان.

**ڕۆتفتان**: ڕۆتەفتان، سرەوتن، دامرکان.

**ڕۆتک** (هەر.): پاتتۆلی دوولینگە. (باک.) داردەست.

**ڕۆجیار**: (هەورا.) ڕۆژ، خۆر، ڕۆژگار، خۆر، خۆرەتاو.

**ڕۆجیارپەرس** (هەورا.): گوڵەبەڕۆژە، ڕۆژپەرست، ئازەری.

**ڕۆجیارپەرسی**: ڕۆژپەرسی.

**ڕۆجیارپەرست**: گوڵەبەڕۆژە.

**ڕۆجنە**: تێرتێرە، کمریسە.

**ڕۆجیارپەرست**: جوورە قومقومەیێکە هەمیشەڕوو لەخۆردەکات.

**رۆجیارگیریای** (هەورا.): ڕۆژگیران.

**رۆجیارنیشتەی** (هەورا.): ڕۆژاوابوون.

**رۆجیارهۆرامای** (هەورا.): ڕۆژهەڵاتن.

**رۆجیاری** (هەورا.): تیشکی ڕۆژێ.

**رۆچە**: ڕۆژرو.

**رۆچەوان** (هەورا.): ڕۆژرووران.

**رۆچن** (ئەردە.): ڕۆشن، کلاوڕۆژنە، ڕۆچنە، کولانە.

**رۆچنایی** (هەورا.): ڕۆشنایی.

**رۆچنە**: درەوانکە، (مامە.) کونەباجە، (دەر.، شار.) کولانە، کولانکە، کولاوکە، (بابا.) کلاوڕۆژنە، کولاوڕۆژنە، کولەنگ، کولینگ، کولەک، (شار.) کولینک، (باک.) ڕۆژەن، ڕۆژین.

**رۆچوو**: تەپیو، داتەپیو، تەپێ بوو.

**رۆچووانن**: تەپکاندن، تەپک کردن، داکەواندن، تەپێ کردن، تەپاندن، ڕۆبردن.

**رۆچوون**: داکەوتن، تەپان، تەپین، قوپان، بەقوڵیدا چوون، کووپان، (باک.) تەپکین، تەمبکین، (هەورا.) داچوون، جۆم بوون، داهاتن، چوونەخوارەوەی چتێک بەناوئاویابەناوزەویدا، ـــ ی گەمێ: (باک.) پەتاراڤک.

**رۆچێ** (فە.): ڕۆژرو.

**رۆچی** (فە.): ڕۆژرو.

**رۆچیار**: ڕۆژگار.

**رۆخ** (باک.): ڕوو، ڕوخسار. (هەو.، کە.، ڕەوا.، باک.) لا، کن، نک، جەم. کەنار، قەراخ، لێوار، ئالی، تی.

**رۆخان**: ڕووخان و وێران بوون.

**رۆخانە** (هەورا.): ڕووبار، چۆم.

**رۆخانەی ووشک**: چۆخورە.

**رۆخاندن**: ڕووخاندن و وێرانکردن.

**رۆخانراو**: ڕووخێنراو.

**رۆخانن**: ڕووخاندن.

**رۆخاو**: ڕووخاو.

**رۆخە** (دزە.): لەکاتی دروێنەیاگێرەدا ئەو قرشەیەیە، کە کەوتۆتە دەرەوەی خەرمانێ و دەخرێتەوە بەرپێیان.

**رۆدا** (باک.): نیشانەیێکە بەهۆی ویەوە لەدووا ڕۆژ دەدوێن و ڕازانی نهێنی ئاشکرادەکەن.

**رۆدان** (باک.): پەنجەرە.

**رۆدی** (باک.): ڕیخۆڵە.

**رۆڕژان**: دارژان، ڕژکران.

**رۆڕژاندن**: دارژاندن، ڕژکردن.

**رۆرس** (باک.): گیایەکە.

**رۆرۆ**: (هەو.) وەیرۆ، ئەیرۆ، وەیشێرە: بەهاوار و گریان و داد و بێدادێکی دەڵێن کەئافرەتان لەکاتی لێقەومان یامردوو لێ مردنێدا بەکاریدەبەن.

**رۆز** (بابا.): لەیەکدان و درووونی پارچەی کاڵا لەدووای بڕینی.

**رۆزقە**: ڕوزقە، گیایەکی بەهارییەو وەگێلاخەی دەچێ بەکولاوی و برژاوی دەخورێ.

**رۆزگار** (هەورا.): ڕۆژگار.

**رۆزنامە**: ڕۆژنامە.

**رۆزی**: ڕۆژی، زاد، قووت، ڕۆژانە، پێ بژیو. (ئەردە.) سەردروو، کۆک، درووماني لێکدورووست.

**رۆژ**: (هەورا.) خۆر، هوورێر، وەر، ڕۆش، (بادە.) ڕۆ، (ئەردە.) ڕووج، ڕۆژاتەخووەش، (باک.) ڕۆژباش، برۆژکرن (باک.): ئاشکراکردن. ـــ بوون: ئاشکرابوون، بەماوەیەک دەڵێن لەکاتی ڕۆژهەڵاتەوە تا ڕۆژاوا بوونێ. نێوی پیاو و ئافرەتانە.

**رۆژئا** (باد.): ڕۆژاوا.

**رۆژئایی**: ڕۆژاوایی.

**رۆژانە**: ڕۆژانی، هەرۆ، مووچە، جیرە، ئەندازە پارەیێکە، کە ڕۆژبەڕۆژ بدرێ بەشاگردو کارگەران و ئیتر. مووچەی ڕۆژبەڕۆژی منداڵانە.

**رۆژانوو**: ڕۆژنامەیێکی کوردی بووبەتیپی لاتینی نزیکەی سێ ساڵان لە بیروو تێدا لەلایەن دۆکتۆر کامەران بەدرخانییەوە پەخشکراوە.

**رۆژانی** (باک.): ڕۆژانە.

**رۆژاوا**: خۆر نشین، کاتی ئاوابوونی ڕۆژ. شوێنێکە، کە ڕۆژی لێ ئاوا دەبێ.

**رۆژاوایی**: کەسێکە لەهەرێمی خۆرنشینێدا دادەنیشێ.

**رۆژەجووت**: بانە، گاوەخان، بەشە زەویەکە، کە بەتاکە ڕۆژێکی بەجووت بکێڵرێ.

**رۆژەڕێ**: ئەندازە وماوە ڕێگایەکە، کە بە ڕۆژێکی ببڕێت.

**رۆژەلات**: ڕۆژهەڵات.

**رۆژەلاتناس**: ڕۆژهەڵاتناس، خۆرهەڵاتیەوان.

**رۆژەلاتناسی**: ڕۆژهەڵاتناسی، خۆر هەڵاتیەوانی.

**رۆژەلاتی**: دانیشتووی هەرێمی ڕۆژهەڵاتێ.

**رۆژەلاتی دوور**: ڕۆژهەڵاتی دوور، ڕۆژەلاتی ئەوپەڕ.

**رۆژەلاتی ناوەڕاست**: ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

**رۆژەلاتی نێزیک**: ڕۆژهەڵاتی نێزیک.

**رۆژەن** (باک.): ڕۆچنە.

**رۆژەناڕۆژێ**: ڕۆژبووێر.

**رۆژەنە**: ڕۆژەن، کلاوڕۆژنە، ڕۆچنە.

**رۆژباش**: ڕۆژخۆش، ڕۆژخووەش، باشڕۆژ، شەگگە.

**رۆژباشی**: ڕۆژخووەشی، فەتال، فەلات، شەگگە، (باک.) پاتە.

**رۆژبەڕۆژ**: ڕۆژبڕۆژ.

**رۆژبەسەربردن**: مەبەس لەپشوودرێژی و ئارامی و بەڕێ چوونێکە هەر چۆنێکی هەڵبسوورێ.

**رۆژبەیانی**: هۆزێکی کوردە پازدە هەزارماڵ پترە لەباکووری ڕۆژاوای زێی بادینان و لە کەنار کەرکووک دادەنیشن.

**ڕۆژبڕ:** ڕۆژانە، بەکارگەران دەڵێن بەڕۆژبڕ ئەم کارەم بۆبکە.

**ڕۆژبوونەوە:** کۆتایی شەوو دەست پێکردنی ڕۆژێیە.

**ڕۆژبووێر:** ڕۆژە نارۆژێ.

**ڕۆژبووێری:** ڕۆژە نارۆژێک، خەریکی کارو فەرمانێکی بوون.

**ڕۆژپەرست:** خۆرپەرست، هوویرپەرست، کەسێکە خۆری بپەرستێ، ئـازەری، ڕۆجیاپەرس. گیاندارێکە وەکومارمێلکە بەڵام گەورەترە و هەمیشە ڕوولەخۆر دەکا و لەبەر هەتاو گەلێ ڕەنگ دەنوێنێ، گوڵەبەڕۆژە.

**ڕۆژپەرستی:** خۆر پەرستی.

**ڕۆژخووەش:** ڕۆژباش. ـــ ی: ڕۆژباشی.

**ڕۆژڕەش:** بەدبەخت، چارەڕەش. ـــ ی: تەنگانە، سەخڵەتی، لێقەوماوی.

**ڕۆژکا** (باک.): ئێل و دەرەبەگێکی کوردییە لەبتلیسێ ئەمڕۆ پێیان دەڵێن وولاتێ.

**ڕۆژکان:** ڕۆژکا.

**ڕۆژکردنەوە:** نەنوستنە تا بەیانی.

**ڕۆژکووێر:** بەپێچەوانەی شەوکوێرییە.

**ڕۆژگ:** ڕوژوو، پارێز.

**ڕۆژگار:** ڕۆزگار، کات و دەمێکە، کە بەرەبەرە دێت و دەڕوات. ڕۆژ، درێژایی ڕۆژە لەبەیانیەوە تا ئێوارێ، گەردوون، چەرخ، چەپگەڕ.

**ڕۆژگارپەرست:** ڕۆژپەرست، گوڵەبەڕۆژە.

**ڕۆژگارپەرستی:** خۆر پەرستی.

**ڕۆژگارزان:** ڕۆژگارناس، مێژووزان.

**ڕۆژگەوان:** ڕۆژووان، بەڕۆژوو.

**ڕۆژگیران:** خۆر گیران: هووێرگیران، پێشگرتنی ڕووناکی ڕۆژ لەلایەن مانگەوە.

**ڕۆژمز** (ئەردە.): ڕۆژبڕ.

**ڕۆژمز** (ئەردە.): ڕۆژبڕ.

**ڕۆژن** (زا.): کلاوڕۆژنە.

**ڕۆژنامە:** نووسراوێکە ڕۆژ، مانگ و ساڵ نیشاندەدا، ڕۆژمار، ڕۆژمێر. نووسراوێکی چاپکراوە ڕۆژبەڕۆژ دەنگ و باسی ژوورەوەو دەرەوە بڵاو وبەخش دەکات، ڕۆژنامچە.

**ڕۆژنامەچی:** کەسێکە ڕۆژنامەی دەردەکات.

**ڕۆژنامەچیەتی:** ڕۆژنامەنووسی.

**ڕۆژنامەگەر:** ڕۆژنامەچی.

**ڕۆژنامەگەری:** پیشەو کرداری ڕۆژنامەنووسانە.

**ڕۆژنامەنووس:** ڕۆژنامە نڤیس.

**ڕۆژنامە نووسی:** ڕۆژنامە نڤیسی.

**ڕۆژناهی:** ڕووناکایی.

**ڕۆژنایی** (زەن.): ڕووناکی، ڕۆشنایی.

**ڕۆژنە** (بۆتا.): پەنجەرە.

**ڕۆژنەڕۆژێ:** ڕۆژەنارۆژێ.

**ڕۆژنشین:** ڕۆژاوا.

**ڕۆژنشینی:** ڕۆژاوایی.

**ڕۆژوو:** ڕۆژی، ناشتایی، پارێز، پاس، (هەورا.) ڕۆچی. بە ـــ بوون: پاسگرتن، بڕۆژی بوون. ـــ گرتن، پارێزلەخواردن و خواردنەوە و کردنی هەندێ کرداری ڕێنەدراو بەناوی خودا پەرستییەوە.

**ڕۆژووگر:** (باک.) ڕۆژووان، پارێزڤان.

**ڕۆژووگرتن:** بەڕۆژووبوون.

**ڕۆژووان:** ڕۆژووگر، بەڕۆژوو، (هەورا.) ڕۆچەوان، (باک.) پارێزڤان.

**ڕۆژوووانی:** پارێزڤانی.

**ڕۆژهەلات:** خۆرهەڵات، خۆرەڵات، ڕۆژەڵات، دەمی سەردەرکردنی ڕۆژە، ڕۆژهەلات. شوێنێکە ڕۆژی لێ هەڵبێ.

**ڕۆژهەڵاتن** (کە.): خۆرهەڵاتن، هووێرهەڵاتن.

**ڕۆژهەڵاتناس:** خۆرهەڵاتناس.

**ڕۆژهەڵاتناسی:** خۆرهەڵاتناسی.

**ڕۆژهەڵاتی:** دانیشتووی ڕۆژهەڵاتی.

**ڕۆژهەڵاتی ئەوپەڕ:** ڕۆژهەڵاتی دوور.

**ڕۆژهەڵاتیەوان:** خۆرهەڵاتناس.

**ڕۆژهەڵاتیەوانی:** خۆرهەڵاتناسی.

**ڕۆژهەڵاتی دوور:** ڕۆژهەڵاتی دوور، ڕۆژهەڵاتی ئەوپەڕ، ئەوپەڕی ئاسیایە بەلای ڕۆژهەڵاتەوە.

**ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست:** ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، نێوڕاستی ئاسیایە.

**ڕۆژهەڵاتی نێزیک:** ڕۆژهەڵاتی نزیک، خۆر هەڵاتی نزیک، کەناری ئاسیایە بەدیوی دەریای سپیدا.

**ڕۆژهلات** (باک.): ڕۆژهەڵات.

**ڕۆژی** (باک.): ڕۆزی، زاد، قووت، پێ بژیو، ڕۆژوو.

**ڕۆژی ئازادی:** ڕۆژی سەربەستی، ڕۆژی سەربەخۆیی، نەورۆز، ڕۆژی ڕزگاری.

**ڕۆژیار** (هەورا.، ڕۆژ.): خۆر، ڕۆژ.

**ڕۆژیارپەرست** (ڕۆژ.): گوڵەبەڕۆژە.

**ڕۆژی دەر:** خودای ڕۆزیدەر.

**ڕۆژی دوایی:** ڕۆژی دوایین، پاشەڕۆژ، پەسڵان.

**ڕۆژێکی:** (باک.) ڕووکێ، ڕۆژەکی.

**ڕۆژین** (باک.): ڕۆچنە.

**ڕۆژێ نەڕۆژێ:** ڕۆژەنارۆژێکی، ڕۆنەڕۆ، نۆگە.

**ڕۆژیولفار** (ئەردە.): سەڵەف، بەپێچەوانەی شەونخوونی.

**ڕۆستەم:** ناوی نێرینانە، ناوی پاڵەوانێکی کوردبوو ناوی بابی زاڵ و ناوی دایکیشی ڕوودابە بووە. سەعدی دەڵێ:

**دانی، کە چە گفت زال با روستم گرد**
**دوشمن نتوان حقیر و بیچارە شمرد**

لەبەر نەکێشان(کرد)ەکەیان کردۆتە گرد.

**ڕۆش** (ژا.): ڕۆژ

**رۆشتن** (باد.): رۆیشتن.

**رۆشن**: تروسکەدار، پەیدا، ئاشکرا. (هەورا.، کە.) رەوشەن، رووناک، (کە.) رۆشنا، گەش. ئاشکرا، دیار.

**رۆشنا** (ئەردە.): رۆشن، رۆشنایی. پتر لەگەڵ ووشەی ئاشنادا بەکاردەبرێ، ئاشناو ــــ: دوست، ناسیاو.

**رۆشنایی** (هەورا.، فە.): رووناکی، شۆق، سۆما.

**رۆشنایی نەفتاو** (فە.): پرشنگی خۆر.

**رۆشنەوبوون**: رووناک بوونەوە.

**رۆشنەوکردن**: رووناک کردنەوە.

**رۆشن بوون**: رووناکبوون، داگیرسان.

**رۆشن بوونەوە**: ئاشکرابوونەوە، دەرکەوتن، رووناکبوونەوە، برێتییە لەدەرکەوتنی مەبەستێکی نادیار.

**رۆشن کردن**: رووناک کردن، داگیرساندن.

**رۆشنبیر** (هەورا.): رەوشەنبیر.

**رۆشنبیری** (هەورا.): رەوشەنبیری.

**رۆشنکردن**: رووناککردن.

**رۆشنکردنەوە**: رووناککردنەوە.

**رۆشنویر** (هەورا.): رەوشەنبیر.

**رۆشنویری**: رەوشەنبیری.

**رۆشنی**: رۆشنایی، رووناکی.

**رۆغان** (لو.): رۆن.

**رۆڤ** (باک.): رق، قین، کین، رک، (باک.) رۆڤک.

**رۆڤک** (باک.): رق، رک. (زا.) تووکی بەر.

**رۆڤی** (باک.): رێوی، ڕیخۆڵە.

**رۆکەوتن**: داکەوتن، دامرکان، دڵنیابوون، درێژبوون، ڕاکشان، پاڵکەوتن.

**رۆکراو**: داکراو.

**رۆکردن**: داکردن، ئاویاچتی ووشک وەکوو دانەوێڵە وئیتر لەچتێکەوە لەناو جەواڵ ویا دەفرێکیتر کردن یا لەسەر زەوی هەڵڕشتن.

**رۆگە** (موک.): ئاوێنە.

**رۆل** (باد.، باک.): رۆڵ.

**رۆڵ**:ژاڵە. گیایەکە وەکوو لاولاو بەداران هەڵدەچێ.

**رۆڵە** (باک.): رۆڵە. (باد.) منداڵ، گدی، کۆرپە، مناڵ، منداڵیشی پێ بانگدەکرێ.

**رۆڵەخوای** (هەورا.): ڕیخۆڵە، رۆڵەخۆ.

**رۆڵک**: ژاڵە.

**رۆم**: نەتەوەیەکی ناودارو گەورەیە کوردان لەدەستی وان گەلێک زیان و ئازاریان دیتووە، زۆرجاران زێی فورات سنوری کوردان و رۆمان بووە، ئەمرو کوردان بەترکی ئەنەدۆڵی دەڵێن رۆم وادیارە کەترکان جێگای رۆمانیان گرتووە.

**رۆمەڵغەزا**: رۆژی پەلامارداني رۆمان، هۆمەلغەزا.

**رۆمی**: کوردان بە ترکان دەڵێن رۆمی، خانی پایە بەرز دەفەرمووی:

ئەڤ رۆم و عەجەم بەوان حەسارن

کورمانج هەمی لەچارکەنارن

**رۆن**: چەورییە، کەلەماست وشیر و گەلێ چتیتر دەگیرێ، روهن، چەوری، بۆ، ــــ یکەرە: کەرە، ــــ ی زەنگ: رۆنی تووڕاوەوە، تەواش، ترنگ، ئاوودۆی تەڕ و ئاواوی وشل. (باک.) رووناک، شەبەق، رۆشن، هەیڤەرۆن، مانگەشەو، فرمێسک، حێستر، رۆنک، ئەسرین. روون.

**رۆناک** (باک.): رووناک، رۆندار.

**رۆناکی** (باک.): رووناکی.

**رۆنان**: دانان.

**رۆناو**: چەورێکە وەسەر مەنجەڵی بکەوێ و تێکەڵ بە ئاوێ بووبێ.

**رۆناوی**: چەوروچڵێک.

**رۆناهی** (باک.): رووناکی، نێوی گۆڤارێکی کوردی بووەبەتیپی لاتینی لەشاری شامێ لەلایەن ئەمیرجەلادەت بەدرخانەوە دەردەخرا.

**رۆنایی**: رووناکی، رۆشنایی. (هەورا.) ئاوێنە، جام.

**رۆنەر**: دانەر.

**رۆنەرۆ** (ئەردە.): رۆژەنارۆژێ، نووگە، نۆرە.

**رۆنەکەرە**: رۆنی کەرە، کەرە.

**رۆنەنیش** (باک.): گیایەکە.

**رۆنتک** (باک.، باد.): فرمێسک.

**رۆندار**: رووناک، رەوشەن.

**رۆنداری**: رووناکی.

**رۆنداغکەر**: رۆنداخکەر.

**رۆندکەری**: مرازێکە وەکوو تاوەی دەسکدار وایە رۆنی تێدا داخدەکەن.

**رۆندان**: کەڵە شاخ، مرازێکە رۆنی تێدەکرێ.

**رۆندک** (باک.): فرمێسک.

رۆندک

**رۆن زەیتوون**: رۆنی زەیتوونی.

**رۆنک** (هەورا.): فرمێسک. ڕانک.

**رۆنکونجی**: رۆنی کونجی.

**رۆنگ**: خوری دابەستەیە لەپاش برینەوەی جارێکی تر ببرێتەوە.

**رۆنگەرچەک**: رۆنی گەرچەکی.

**رۆنگرتن**: رۆنی بادام و گوێزو چتی واگرتن، کەرۆنی هەبێ.

**رۆن و ماساوی** (هەورا.): رۆن ماسی.

**رۆنێ**: دانیشە.

**رۆنی**: رووناکی، چتی روون، رۆناهی، رۆشنایی، روونی.

**رۆنیاس**: گیایەکە بەرەکەی وەکوو رەشکەوایە دوگەز بڵندتر دەبێ رەگەکەی وەکوو دار وایە بۆ دەستی شکاو یالە جێ چوو زۆر باشە، گوڵەکانی زەردو وورده و زۆر بە سەر زەویدا ڕادەکشێ و هەر کرو بەنێکی بەبنەکەی کەسوورە، سوور کرێ رەنگی ناچێتەوە سوورێکی تۆخی مۆرکارە بە ووشکراوەیی لەگەڵ زەردێنەی لەسەر هەر برینێکی دانرێ گۆشتە زوونەی لەبنەوە پێ دێنێ و سەرەکەشی دەکاتە قرتاغەوچاکی دەکاتەوە.

**ڕۆنیاسی:** چتێکە ڕەنگی وەکوو ڕەنگی ڕۆنیاسی وابێ.

**ڕۆنی زەیتوونی:** ڕۆنی زەیتی.

**ڕۆنیشاندن:** ڕۆنان، دانیشاندن، ڕۆنیشتاندن.

**ڕۆنیشتن:** (باد.) دانیشتن، ڕوونیشتن، (هەورا.) ئەرەنیشتەی، نیشتەیرە. نیشتن، ڕۆنین، (باک.): ڕوونشتن.

**ڕۆنیشتوو:** دانیشتوو، دانیشتی، ڕوونشتەمان.

**ڕۆنی کونجی:** ڕۆنکونجی.

**ڕۆنین** (باد.): ڕۆنیشتن. ڕووانین.

**ڕۆوانە** (هەورا.): ڕۆژانە.

**ڕۆوئاوا** (هەورا.): ڕۆژاوا.

**ڕۆوڕێ** (شوا.): برۆ.

**ڕۆهاتن:** هەڵوەرینی پرچی ئافرەتانە دووای نەخۆشی.

**ڕۆهایی** (باک.): جوورە هەڵپەڕینێکی کوردییە.

**ڕۆهەڵات** (باک.): ڕۆژهەڵات.

**ڕۆهن** (باک.): شلەمەنی، شل، ڕوون، چتی شل و ڕوون.

**ڕۆهێشتن:** داهێژتن، داهێشتن، داهێلان، شۆڕکردنەوە، شۆڕکردەی.

**ڕۆیار** (کە.): ڕێبووار.

**ڕۆیاندن** (کە.): وەڕێخستن، ڕەوانەکردن، بەڕێکردن.

**ڕۆیدمایی** (هەورا.): ڕۆژی دووایی، دوواڕۆژ.

**ڕۆینە:** جوورە هەڵپەڕینێکی کوردییە لەسەرەخۆ سووڕدەخۆن وخۆیان بەرزناکەنەوە کەپێشڕەوە بۆ سێپێیی. ڕۆیشتن، گەڕان.

**ڕۆینەکونا** (ئەردە.): شکان، ڕەوتێکەوتنی تاکە کەسێک یالەشکرێک.

**ڕۆینەوە:** چوونەوە، گەڕانەوە.

**ڕۆیۆ:** ڕۆژێکی.

**ڕۆیی:** ڕۆییشت.

**ڕۆیشتن:** خۆشڕۆیشتن: پێهەڵێنان، پێهەڵگرتن.

**ڕۆییشتن:** کۆچکردن، چوون، ڕۆیین، چین، چووین، ڕەوان بوون، مەلای، وەرسیان، (هەورا.) لووای، لوان، (شەبە.) بل، وەرسیان.

**بڕۆ:** ڕۆوڕێ، لوە، هولوو، بچە، هەرە، هەرۆ، بەسەر ـــ : سەرزەنش کردن، ئامۆژگاری کردن، لەسەر ـــ : پێداگرتن، پێداچوونەوە، خووار، بنار، هەتەر.

**ڕۆییشتوو:** چوو، ڕۆییو، کۆچکردوو، ڕابردوو.

**ڕۆیین:** ڕۆیشتن، چوون.

**ڕۆیینە:** ئەوکەسەیە، کەبڕوا.

**ڕوب:** ڕب، شیلە.

**ڕوبەب:** کەمان، کەمانچە، ڕباب، مرازێکی سازوئاوازە.

**ڕوبێدە** (هەو.): مردە، بەسەر.

**ڕوخ** (باک.): ڕوو، ڕوخسار. پیشە خۆرە، ئێسکخۆرە، باڵندەیێکی ئەفسانەییە. (باک.) کەنار، قەراخ، لێوار. ناوی دوودانشانە لە داشەکانی شەترنج.

**ڕوخە** (ئەردە.): ڕوخەک.

**ڕوخەک** (ئەردە.): چتی داڕووخاو، ڕووخیان، ڕزیان.

**ڕوخزیی:** تیرەیەکە لەهۆزی جاف و کۆچەران.

**ڕوخسار:** ڕوو، ڕووچک، ڕوخ، دیم، ڕەنگ و ڕوو، چارە، چرۆچاو، دەم و چاو، جەفەر، چرۆچەم، دیدار، شێوە. نێوی ئافرەتانە.

**ڕوخسارە:** ڕوخسار، ڕوو، چارە.

**ڕوخیاگ:** ڕووخاو.

**ڕوخیان:** ڕووخان.

**ڕوزد** (بابا.): بەرچاوتەنگ. ـــ ی: بەرچاوتەنگی.

**ڕوش:** ڕووش، زبر. گڕوێ، ئاولاوی. زوڕ.

**ڕوشتە:** هەودای بادراو.

**ڕومێل** (باد.): باڵندەیەکە لە چیایاندا وەکووکۆتری وایە.

**ڕوندک** (باک.): فرمێسک.

**ڕونگ** (هەورا.، هەر.): ئەوتووکەیە، کە لەدووای بڕینەوەی ئاژاڵان تا سێ مانگان لێی دێتەوە کە دووبارەش بڕیانەوە هەر ـــ ی پێدەڵێن کە بڕیشیانەوە هەر ـــ ی پێدەڵێن.

**ڕوە** (زاخ.): ڕیش، ڕدێن، (زاخ.) ڕە. (ئەردە.) بەری کاڵا.

**ڕوهن** (باک.): ڕۆن.

**ڕوهند** (باک.): ئاشکرا، خویا، دیار.

**ڕوهنی** (زا.): ڕوونی، ئاشکرایی، ڕووناکی.

**ڕویال** (باد.): چەقین، شووێنی کرێن.

**ڕوو:** چرۆچاو، ڕوخسار، چارە، دەم و چاو، (باک.) ڕووچک، ڕووچ. ڕوخ، سکووم، جەفەر، (باک.) دێم، بە ـــ دادانەوە: شەرمەزارکردن، وەڕوو دانەوە، دان ڕوو، بەچاودادانەوە، بەڕوو: بەڕێز، بێڕوو: بێشێواز، بێشەرم. (فە.) ڕێوی. هۆ، مایە، بۆنە، لە ـــ ی ئەوەوە: بەهۆی ئەوەوە، ڕووکار، دیوی دەرەوەی هەر چتێکی بێ، بەردەم. (باک.) چۆم، ڕووبار. زات، بڕ، ئازایی: ئازاد لە ـــ ی هەڵنایە بتدووێنێ واتە زات ناکات. ساختە، ڕووالەت، ڕیو.

**ڕووار** (ئەردە.): ڕووبار، چۆم، چەم، شووێنێکە ڕووباری زۆر لێبێ.

**ڕوواس** (هەورا.): ڕێوی.

**ڕوواسە** (هەورا.): ڕێوی.

**ڕووال:** شۆخ و شەنگ، دڵبەر، لاو، هەرزەکار.

**ڕووال** (هەورا.): ڕەواقی شەکری و هەنگووین و چتیتر، ڕینگاو.

**ڕووالەت:** (هەورا.، بابا.، کە.، جا.) دیمەن، قەلافەت، ڕوو، دیدار، ڕوخسار، تەوس، تووانج، سەرزەنش، ـــ کردن: بەسەرڕۆیشتن، تەووس لێدان، (کە.) مرایی، ڕووپایی، زمان لووسی، کلکەسووتە، ـــ کردن: ڕووپایی و کلکە سووتەکردن.

**ڕووالەتباز:** ڕیاکار، ساختەچی، ڕووساز. ـــ ی: ڕیاکاری، ڕووپایی، ڕووسازی.

**ڕووالەتبازی کردن:** ڕیاکردن، ڕووپایی کردن.

**ڕووان:** ڕەگ داکوتان و سەوزبوونی ڕووەکان و ددان و مووی لەش، ڕووبینی گیاو سەر دەرهێنانییان، دەرچوون، شینبوون، (هەورا.) ڕسان،

(ئەردە.) ڕەوان، وانەکەی ــــ ە: ڕەوانە، (ئــەردە.) ڕەوان، ئــاوی ڕەوان، (ئەردە.) ئەسپی ڕەوان، ڕەوان، ڕام، ڕاوار.

**رووانه:** ڕەوانە.

**رووانەکردن:** ڕەوانەکردن.

**رووانەوە:** خەست و توند بوونەوەی دۆشاو وهەنگوین و هەندێ چتی دی.

**رووانەن:** چەقاندنی شەتڵ و نــەمام، شین کردن، ســەرپێدەرهێنانی رووەک بــەگژوگیاو دارانــەوە دوای پیشــەداکوتانیان. ڕەوانــەکردن، (بــاک.) تاوگازبوون، هەتاوبردن.

**رووانگـە:** جێگای تایبەتییە، کە بەئاسانی مـانگی یەکشـەوەو ئەسـتێرەی تێدا بدۆزرێتەوە، کۆلیتگا، کالیتگا.

**رووانین:** تەماشاکردن، ڕامینان، (هەورا.) مدیای: مذیـای، نوواڕیـن، وورددەوبوون، سەرنجدان.

**رووەو:** چتێکە شین بووبێ و ڕەگی داکوتابێ لەدووای ناژتن و چەقاندنی.

**رووەوە:** چتێکە خەست و پەیت بووبێتەوە.

**رووە** (هەورا.): ڕوو، ڕوخسار، دیمەن، دیوی دەرەوە، (کە.) لا.

**رووەدای** (هەورا.): ڕوودار.

**رووەدۆشەگ:** ڕوودۆشەگ.

**رووەزەیتوون** (هەورا.): ڕۆنزەیتوون.

**رووەسەنیر:** ڕووەبالیف.

**رووەک:** شیناوەردی بەهــەموو جووره گژوگیـاو دارو دەوەنێکــەوە. ــــ ی: خۆڕسکی.

**رووەن** (هەورا.): ڕۆن.

**رووەنگـەرچەک** (هەورا.): ڕۆنگەر چەک.

**رووەن ماساو** (هەورا.): ڕۆنماسی.

**رووەن و زەیتوونی** (هەورا.): ڕۆنزەیتوون.

**رووەن و کەتانی** (هەورا.): ڕۆنکەتان.

**رووەو:** بەرەو، بەرانبەر، ــــ من هات: بەرەومن هات.

**رووب:** ڕوب.

**رووبا**(لو.): ڕێوی.

**رووبادان:**: سەرروەرگێران.

**رووبار:** چۆم، ڕووبەڕوو. (ڕەوا.) چۆم، چەم، ڕووار.

**رووباربوونەوە:** (ئەردە.) بەرەوڕووبوونەوە.

**رووبارکاری:** ڕووبەڕووبوون.

**رووباری** (باک.): ڕووبەڕوو، هەمانە.

**رووباری کرن** (باک.): ڕووبەڕووکردن.

**رووباریٚ هەڤکەتن:** دیدەنیکردن.

**رووباز:** ڕیاکار، زمان لووسی.

**رووبـازاری:** مەبەس لـە ئـافرەتی جـوان و شـۆخە. بۆچتێـک بـەکاردەبرێ کەبەدیمەن جوان بێ زوو بفرۆشرێ. ڕیاکاری، زمان لووسی.

**رووبال** (زا.): بەرەوڕووبوونەوە.

**رووبالگەهـ** (باک.): ڕووسەنیر.

**رووبە:** بەرەو، بۆلای، (باک.) بەر. ــــ بازاڕچوو: بەرەو بازاڕ چوو.

**رووبەڕا** (ئەردە.): ئامادە، ساز.

**رووبەڕاکردن:** ئەنجامدان، پێکهێنان.

**رووبـەڕوو:** بــەردەم، پێــش. بەرانبــەری یــەکتری، بــەرە و ڕووی یــەکتری، بەرانبەری ڕووی یەکتری ، پێشــبەری هــەڤ، هەمبــەران، هنبــەر، ڕوبەهــەڤ، مەبەس لە دوو یا چەند کەس یا چتانە کەڕوویان لە یەکتری بێ.

**رووبەڕووبوون:** تووشبوون، تووشهاتن، یەکتر دیتن.

**رووبەڕوو بوونەوە:** بەرەوڕوو بوونەوەی دوو یا چەند کەسان.

**رووبەڕوو کردن:** تووشکردن، بەدیدەنی یەکتری گەیاندن، ڕووبارکاری.

**رووبەڕوویی:** بەرانبەری.

**رووبەنە** (ئەردە.): ڕووبەند.

**رووبەند:** (ئەردە.) ڕووپۆش، ڕووبەنە، چارەپۆش. (هەو.) پێچە، پەچە، (هەورا.) بەرچەم، خاڤک، خێلی.

**رووبخوری:** گرویٚ، ڕووبە خرویٚرکە. ئاولاٚری.

**رووبۆسی:** ماچ و مووچ.

**رووبین:** لەڕوودامار.

**رووبینی:** لەڕوودامان.

**رووپاک:** ڕووخۆشی، دڵپاک.

**رووپاکی:** دڵپاکی، ڕووخۆشی.

**رووپامایی:** ڕووالەتکردن.

**رووپایی** (کە.): مرایی، ڕووالەت، کلکە سووتە، زمان لووسی.

**رووپەڕ:** سەرپەڕ، شکڵ، وێنە، نیگار. لاپەڕە، ڕووپەڕە، زوویر، تووڕە.

**رووپەڕە:** لاپەڕە، ڕووپەڕ، (باک.) ڕووپەل، دیوێک لەپەڕە قاقەز.

**رووپەڕبوون:** زوویرو تووڕە بوون.

**رووپەڕکردن:** زوویرو تووڕەبوون.

**رووپەڕی:** زوویری، تووڕەیی.

**رووپەری:** جوانی.

**رووپەل** (باک.): لاپەڕە.

**رووپشت:** ئاستەڕ.

**رووپۆش:** پێچە، ڕووبەند، چارەپۆش، پارچەیێکی تەنکە ئافرەتان لــەکاتی چوونــە دەرەوەدا ڕووی خۆیــانی پێدادەپۆشــن. ســەرپۆش، ســەرئەنداز، پەردەیێکە بەسەر سینی و چتیتر دادەدرێت.

**رووپۆشین:** ڕووگرتن: ڕووداپۆشین.

**رووپێدان:** ڕوودان، زۆر دوواندنی یەکێک و ڕووی خۆشی نیشاندان.

**رووت:** پەتی، سادە. ڕاست، بێ پەناوپێچ، بێ پەردە، کۆت، پەتی، قووت، تازی، ڕەوسی، ڕووتەڵە، قووتەڵــە، بــووت، ڕووس، بــێ پۆشــاک، بــێ جــل وبەرگ، زەلووت، خاووس، کۆل، وێژە، (باک.) تازی، چیپ.

**رووتداری:** بێ پەلک و گەڵا.

**رووتا:** تێلێکی کوردەلە (دێرک) ی چیای مازوو ماڵی حاجی نــەجیمی برا گەورەی ڕووتا بووە، ڕەشید کورد خاوەندی ڕێزمانی کرمانجی لەو تێلەیە، کە لە ڕۆژاوای ماردینێیە.

**رووتاڵ:** مۆن، رووگرژ، توورە. ــ ی: مۆنی، رووگرژی، توورەیی.

**رووتانەوە:** داڕووتان، هەڵوەرینی گەڵای دار و مووی گیاندار و تووک و پەڕی باڵندان. وەشکەڕنی موو و خوری لە پێستەوە هەڵکێشانی.

**رووتاندن:** ڤەڕووتاندن.

**رووتاندنەوە:** بە زۆر کەل و پەل لەم و لەو ئەستاندن، ڤەڕووتاندن، پووتاندنەوە، ڤەڕووچکاندن، بەرگ پێدا کەندن، داڕووتاندن، رووتکردنەوە، دەسکەنەی مووی گیاندار ومو و خوری پێستان. لێکردنەوەی گەڵای داروبار و بەروبوی دار و باخچان ڕنین، ــ ی مریشک و پەڕەووران: ناوەڕووتکردن، پەرتانن.

**رووتانن:** رووتاندن.

**رووتاننەوە:** رووتاندنەوە، داڕنین، ڕنینەوە.

**رووتاوە:** رووتاوەوە.

**رووتاوەوە:** داروگیانداروو پەڕەوورێکە، کە گەڵایاموو یا پەڕی وەریبێ و رووت بوو بێتەوە.

**رووتە:** داروباری بێ گەڵا و گیانلەبەری بێ پۆشاکە، رووتەڵە.

**رووتەخت:** (ئەردە.) تارایەکی سوورە بەسەر ئەو تەختەدا دەدرێ، کە بووکی تێدا سوار دەکرێ بۆ مردووان ڕەشە.

**رووتەڵ:** رووتەڵە.

**رووتەڵە:** رووتە، بۆ داروبارو گیان لەبەرانی رووت بەکار دەبرێ.

**رووتەن** (ئەردە.): ڕەشانگی نێو بەفری، (ئەردە.) جێگایەکە گژوگیاو داروباری لێ نەبێ.

**رووتەنی:** رووتەن.

**رووتەوەبوون:** رووتبوونەوە.

**رووتەوەکردن:** رووتکردنەوە.

**رووتەوبوون:** رووتەوەبوون.

**رووتەوکردن:** رووتکردنەوە.

**رووتەهەل** (باک.): رووگرژ، توورە.

**رووتەهەلبوون** (باک.): رووتاڵ و توورە بوون.

**رووتەهەل کرن:** (باک.): رووتاڵ و توورەکردن.

**رووتەهەلی** (باک.): رووتاڵی، توورەیی.

**رووتبوون:** شەلیان، رووپال، نەمانی گەڵای دارومووی گیاندار و پەڕی باڵندان.

**رووتبوونەوە:** داکەندنی پۆشاکی بەر.

**رووترش:** رووگرژ، رووتورش، مۆن، گرژ، توورە، مچ و مۆڕ، مشومۆڕ.

**رووترشاو:** رووتورش، مۆن، گرژ، توورە، مچ ومۆڕ، مشومۆڕ.

**رووترشبوون:** مۆنبوون، گرژبوون.

**رووترشکردن:** مۆنی، گرژی، توورەیی.

**رووترشی:** مۆنی، گرژی، مچ و مۆڕی.

**رووترشیاگ:** رووترشاو، مۆن.

**رووتکردن:** چەڵکردن، شیلاندن، داپلۆسین، داپەلۆسین، شەلاندن، رووتکردنەوە، هەڵوەشاندنی تفەنگ ودەمانچە بۆ پاککردنەوەی. داڕنینی لق و پۆپی داران و رووتاندنەوە ی مووی سەروپێ.

**رووتکردنەوە:** داماڵینی بەرگ و پۆشاک لەبەر یەکێکیدا.

**رووتلە** (ئەردە.): رووتەڵە، رووت و قووت.

**رووت و راست:** بێپەردە، پۆستکەندە.

**رووت و رەجاڵ:** قەلەوقووتە، رووتوقووت، بێ جل و بەرگ، بێ پارەوقووت.

**رووت و رەجاڵی:** بێجل و بەرگی، بێ پوول و زادی.

**رووتوورش:** رووترش، ناوچاوترشیاگ، چرچاوترشیاگ.

**رووتوورشی:** رووترشی.

**رووتورشیاگ:** رووترشاو، مۆن، گرژ.

**رووتوقووت:** رووت و بێبەرگ، ڕەش وڕووت، هەژارودەستکورت. ــ ی: بێجل وبەرگی، هەژاری، بەلەنگازی.

**رووتی:** (باک.) زەلووتی، رووسی. رووتێتی.

**رووتیانەوە** (ئەردە.): رووتانەوە.

**رووتێتی:** تازێتی، رووسێتی.

**رووتێکردن:** تەماشاکردن. پەنا بۆ کەسێک بردن بۆ داخوازیەکی یا بەرەو شوێنێک ڕۆیشتن، بەرتێکردن، رووکردنە چتێک، رووکردن.

**رووجێگە:** رووجا، رووەدۆشەگ.

**رووچ:** رووچک.

**رووچەرخان:** روو وەرگێڕان.

**رووچەرخاندن:** روو وەرگێڕاندن.

**رووچەرخێن:** روو وەرگێڕ.

**رووچەرخێنەر:** روو وەرگێڕ.

**رووچک** (باک.): دزێو، ناحەز، روو، روخساری ناشیرین، دەم و چاو، بۆ هی ناشیرین بەکاردەبرێ.

**رووچکان:** دزێوبوون.

**رووچکاندن:** سووککردنی تووک ومو، برووچکێنە، سووکیکە.

**رووچکێن:** ناشرینکار.

**رووچکێنەر:** ناشرینکار.

**رووچکین:** ناشیرینبوون.

**رووخ:** بروانە: ڕوخسار.

**روخ:** مرازێکە لەکەرەستەی گەمەی شەترەنجێ.

**رووخان:** (هەورا.) ڕمای، ڕەمای. هەرفتن، هەرفین، هرەفان، تەپین، داتەپین، هەرافتن، هەرەس هێنان، داڕووخان، هەرشین، هەرستن، بەربوونەوە، (فە.) ڕمین، کەوتنی دیواروشاخ وچتی دی.

**رووخانە** (هەورا.): چۆم.

**رووخاندن:** کاوول و وێرانکردن، هەرەڤانن، تەپاندن، داتەپاندن، بەردانەوە، هەرڤاندن، ڕماندن، رووخانین، داڕووخاندن، هەرشاندن، هەرشتاندن، (هەورا.) ڕمانن، ووڕنای. خراوکردن، خاپوورکردن.

**رووخانن:** رووخاندن.

**رووخانۆکە:** ریحانە.

**رووخاو:** داڕووخاو، ڕماو، جێگایەکە ڕمابێ. ــ ی: ڕمانی، ڕماوی.

**رووخەک** (ئەردە.): چتی داڕووخاو.

**رووخەڵە** (هەورا.): ڕیخۆڵە.

**روختە** (کە.): ڕەختە.

**رووخست** (باک.): بەرماڵ، دووگرد. کۆڕنۆش.

**رووخستگە**: کۆڕنۆشگە.

**رووخستن**: کۆڕنۆشبردن، ـــ ەردێ (باک.) کۆڕنۆشبردن.

**رووخلاکۆر** (هەورا.): ڕیخۆڵەکوێرە.

**رووخۆش**: (هەورا.) ڕووگەش، ڕوو وەش. خۆش مەشرەف، خۆشڕوو، دەم بە پێکەنین، زمان شیرین، مێرەوان. ـــ ی: ڕووگەشی، (هەورا.) ڕوو وەشی، (باک.) خۆشڕوویی، بسکە، بسکەبسک، ڕووگوشاد، کەیفخۆش، شادمان، زمان شیرینی، مێرەوانی.

**رووخوروک**: گرویێ، ڕووبەخرویرکە.

**رووخوری**: ڕووخورۆک، گرویێ، ڕووبەخروێرکە.

**رووخیاگ**: ڕووخاو.

**رووخیان**: ڕووخان.

**رووخێن**: ڕووخێنەر.

**رووخێنەر**: ڕووخێن، داڕووخێن، وێرانکار.

**رووخێن**: ڕووخان.

**رووداڕ**: ڕووقایم، نەترس، خاوەندڕوو، ئازا، بەڕێز، بەڕوو.

**رووداماڵراو**: ئابڕووتکاو، بێشەرم، ڕووهەڵماڵراو. ـــ ی: بێشەرمی، بێ ئابڕوویی، ئابڕووبراوی.

**رووداماڵیاگ** (ئەردە.): ڕووداماڵراو.

**رووادن**: ئاوڕلێدانەوە، ڕووپێدان، ڕێزگرتن، بەهەندگرتن، میهرەبانی نواندن، بەدەمەوەدان. قەومان، پێشهاتن، پەیدابوونی چتێک لەنوێوە، بەچاودادانەوە، بە ڕووادانەوە، چاوکوتانەوە.

**روداو**: قەوماو، چتێکە ڕوویدابێ.

**رووەدەربایس**: ڕووگیر، شەرمەزار.

**رووەدەربایست**: ڕووگیر، شەرمەزار. ـــ ی: تێبینی، پاشەڕۆژ، ڕووگیری، شەرمەزاری. ـــ کردن: تێبینی کردن، شەرمەزارکردن.

**رووەدەربایسی**: ڕووەدەربایستی.

**رووەدڵ**: گرفت، قورسایی.

**رووەدۆشەگ**: بەردۆشەگ، سەردۆشەگ.

**رووەدێم** (باک.): ڕوومەت.

**رووەدێن** (باک.): ڕزیین.

**رووەدی** (باک.): پیرێژنێکە لەنێوانی پیاو و ژناندا هاتوچۆیەکات.

**رووەڕەش**: شەرمەزار، ڕووزەرد، بێ ئابڕوو، گوناهکار، گوناهبار، تاوانبار، ڕووسار، تەریق، شەرمەزار. ـــ بوون: شەرمەزاربوون، بەخۆداشکانەوە، ئابڕووچوون. ـــ کردن: شەرمەزارکردن، بەخۆداشکاندنەوە، ئابڕووبردن. ـــ ی: شەرمەزاری، تەریقی.

**رووزەرد**: ڕووڕەش، شەرمەزار. ـــ بوون: شەرمەزاربوون، تەریقی. ـــ کردن: شەرمەزارکردن. ـــ ی: شەرمەزاری.

**رووزڤراندن** (باک.): ڕوو وەرگێڕاندن.

**رووزڤرین** (باک.): سەروڕوو وەرگێڕان.

**رووژە** (باک.): ئەڵماس.

**رووژەنە**: ڕۆچنە، کولانە.

**رووس**: عووررووس، حوررووس. (باد.، باک.) ڕووت، تەنها بۆ چوارپێیان وچتمەکان دەبێ.

**رووسار** (باک.): ڕووسارد، ناهومێد، شەرمەزار، پەشیمان.

**رووسارد**: شەرمەزار، تاوانبار، بێ ئابڕوو، ڕووڕەش، کەسێکە، کە ڕوو و زمانی ساردوسڕبێ.

**رووساردی**: ناهومێدی. تاوانباری، گوناهباری.

**رووساری**: ڕووساردی.

**رووسە** (باڵە.، شار.): بووڕەدێر، (گۆ.) قوڕاو، زەوی دێم و ڕەق ئاوکردن بۆ ئەوەی نەرم بێ بۆ کێڵان.

**رووساندن**: مێوژ یا جەفت وئیتر بەکوتانێ نەرمکردن.

**رووسەخت**: ڕووقایم، بێشەرم. ـــ ی: ڕووقایمی، بێشەرمی.

**رووسەرین**: ڕووسەنیر، ڕوو بالیف.

**رووسەم** (ئەردە.): ڕۆستەم.

**رووسپانی** (باک.): ئابڕوو، ئابڕوومەندی.

**رووسپیتی**: ڕووسووری. بریتییە لە کچێتی بووک.

**رووسپی**: ڕووسوور.

**رووسوور**: سەربڵند، سەربەرز، بێ پەڵە و نەنگ، ئەمەگدار. ـــ ی: سەربڵندی، ئەمەگداری.

**رووسی**: زمانی عووررووسان.

**رووش** (ئەردە): بێشەرم، تووش، (هەورا.) ڕوش، زبر، زوور، دڕ. پڕووش، ڕیشاڵ، تەختەکە ـــ ی هەڵداوە. مرۆی ڕوو ئاولاوی و گرویێ. جوورێکە لەبەری دارەمازوو، کە چڵچڵاوییە، ڕووکیان، ڕووک، ڕووشان.

**رووشاڵ**: (ئەردە.) ڕووش، ڕیشاڵ.

**رووشان**: ڕووکان، داڕووشان، برینداربوونی لەشی مرۆ یا هەندێ چتی دیکەیە، کە چتی دڕو زبریان وێکەوتبێ. ـــ دن: ڕووکاندن، داڕووشاندن، بریندارکردنی کەمێ لەشی مرۆڤ و چتی دیکەیە. ـــ ن: ڕووشاندن.

**رووشاو**: داڕووشاو.

**رووشاوی**: داڕووشاوی، چتێکە، کە ڕووش و تلیشی هەڵدابێ.

**رووشە**: قۆرت، چورتم، سەرپێهاتی، تاوێر، شوورەت، هەنگامە، (باک.) بوونەبوون. گل، گۆنگەڵ، پەند، تەلەزگە، داو، کلۆلی، ئاسیو، گرداف، کۆسپە، لیل، وەی، گێچەڵ، کەڵەک، گۆسرمە، تەگەرە، کارەسات، قەوماو، بەسەرهات، پەتەر، تووشی ـــ هاتن: تووشی گێچەڵ و کۆسپەبوون.

**رووشبیەی** (هەورا.): داڕووشان.

**رووشکان**: شەرمەزاربوون، تەریق بوونەوە. ـــ دن: تەریق کردنەوە وشەرمەزارکردن. ـــ ن: ڕووشکاندن.

**رووشکاو**: شەرمەزار، تەریق. ـــ ی: شەرمەزاری.

**رووشکردن**: ڕووشاندن.

**رووشکنای** (هەورا.): رووشان.

**رووشکێن:** تەریق کەرەوە، رووشکێنەر.

**رووشکێنەر:** رووشکێن.

**رووشکێنی:** تەریقکردنەوە، شەرمەزارکردن.

**رووشوشتن:** نادروستی، نارەوابوون، ناساخی، دەستپیسی.

**رووشوشتی:** نادروست، نارەوا، دەستپیس.

**رووشیاگ:** رووشاو.

**رووشیان:** رووشان، رووکیان.

**رووڤ:** (باک.) بەر، بەری مرۆڤان.

**رووڤی:** (باک.): ڕێوی.

**رووڤی رەش:** (باک.، زا.): ڕیخۆڵەی ئەستوور.

**رووڤی سۆر** (باک.): ڕیخۆڵەی باریک.

**رووقایم:** ئازا، بێ شەرم، بێ ترس، قاڵ. ـــ ی: ئازایی، بێ شەرمی، بێ ترسی.

**رووک** (ئەردە.): رووش، رووک، خەراش.

**رووکار:** روو، رووکار، دەمکار، روو و دیوی دەرەوەی چتی. رووبەروو.

**رووکان** (فە.): رووشان. ـــ دن: رووشاندن، داڕووشاندن.

**رووکانن:** رووشاندن، رنین.

**رووکە** (ئەردە.): رنە.

**رووکەش:** رووماڵ، دیمە، رووکێش، چتێکی جووانە، کە بەرووی چتێکی دزێوە وە بگیرێ بەلای دەرەوەی.

**رووکەش:** رووکێش. ـــ کردن: رووکێش کردن، داپۆشینی رووکاری دزێوی چتێکی بە چتێکی جووانتر.

**رووکەشی:** رووکێشی.

**رووکرانەوە:** شەرم شکان.

**رووکراوەوە:** شەرم شکاو. ـــ یی: شەرمشکاوی.

**رووکردن** (خانە.): شەرمکردن، رووتێکردن.

**رووکردنەوە:** شەرم شکاندنی یەکێک.

**رووکرن:** رووکردن.

**رووکێ** (باک.): ڕۆژێکی.

**رووکیان:** (ئەردە.) رووکان، رووشان، رنیان، رنران.

**رووکێش:** رەکێشە (گیایەکە). رووکەش. جوورە قاپ و پیاڵە و دەفرو دەرییەکی تەنەکە یا لە کانی ترە و رووکێش کراوە، (هەورا.) چینکۆ.

**رووکێشە:** رەکێشە.

**رووکێش کردن:** رووکەشکردن.

**رووکێشی زێر:** رووکەشی زێڕ.

**رووکێشی زیو:** رووکەشی زیو.

**رووگە:** لای باشوور، (قبلە).

**رووگەردان:** روو وەرگێڕ، پشت تێکار، هەڵوەگەریاگ، هەڵگەریاگەوە. رووگیر، رووەدەریاییس، شەرمەزار، شەرمێوون.

**رووگەش:** رووخۆش، دڵخۆش، دەم بە پێکەنین. ـــ ی: رووخۆشی.

**رووگر:** روو داپۆشەر، رووبەند، پێچە، پەچە، ڕێزگر، بەدەزوو هەنیە هەڵگر. ئەوکەسەیە گۆڕ یا سەربانان بکوتێتەوە.

**رووگرتن:** رووداپۆشین، ڕێزگرتن، بەهەندگرتن، شەرم کردن، لەرووداممان، بەدەزوو هەنیەی ئافرەتان هەڵگرتن، گۆڕ یا سەربانان کوتانەوە.

**رووگرتی:** رووگرتوو، رووداپۆشراو، قالب بەستنی ماست و چتیتر.

**رووگرژ:** مۆن، رووترش، تووڕە، ترۆ. ـــ ی: مۆنی، رووترشی، تووڕەیی، ترۆیی.

**رووگوشاد:** رووخۆش.

**رووگوشادی:** رووخۆشی، شادی، کەیفخۆشی، (باک.) بسکە، بسکەبسک.

**رووگوڵ:** گوڵروو، بۆ ئافرەتێک بەکاردەبرێ کە رووی وەکوو گوڵی جووان بێ. نێوی ئافرەتانە.

**رووگوهارتن:** روو وەرگێران، سەر سووڕاندن.

**رووگیر:** لەڕوو داماو، رووگر، رووەدەرباییس. ـــ ی: لەڕووداماوی.

**روول** (باک.): ژاڵە.

**روولە:** پس، پز، منداڵێکە هێشتا لەزگی دایکیدا بێ.

**روولەخاگیرپای** (هەورا.): ڕێخۆڵە بەستران.

**روولک:** ژاڵە.

**روولکەن** (زا.): رووخۆش.

**روولەهەڤدیتن:** بەڕێزو نرخداربوون.

**روولێبران:** بێ ڕێزمانەوە، سەرپەرشتی نەکران.

**روولێبراندن:** روولێوەرگێران، بێ ڕێزی پێکردن، لێ ناهومێدبوون.

**روولێبراو:** بێ ڕێز، روولێوەرگێران، ناهومێد.

**روولێبراوی:** بێ ڕێزی، روولێ وەرگێران، لێی ناهومێدبوون.

**روولێنان:** تکاکردن لە یەکێک بۆ کردنی کارێک.

**روولێ وەرگێر:** پشت تێکەر.

**روولێوەرگێران:** پشت تێکردن، زوویر بوون.

**رووم:** تووکی بەر.

**رووماڵ** (باک.، کە.): خاولی.

**رووماڵک** (باک.): سەنیر، سەرین.

**رووماندن:** (باک.): روومینە.

**روومەت:** تەختاییێکی بێ مووە لەژێرچاوان و تەنیشت کەپۆوە. ئەلیک، (شکا.) سوومەت، (بۆتا.) سوومان، (هەر.) رووییمەت، (زا.) شەرەف. (باک.) ناوبانگ، نێوبانگ. ڕێز، روو، هونەر، بێ ـــ : بێ هونەر، بێ ڕێز.

**روومەتگرتن:** ڕێزگرتن. دەم وچاو بەهەنیە هەڵگرتن.

**روومەتگیر:** دەم و چاو هەڵگر، ڕازێنەوە. ڕێزگیر.

**روومەتگیری::** دەم وچاو هەڵگرتن. ڕێزگرتن.

**ڕوون:** سەرودڵخۆشی. ڕووناک، ڕەوشەن، ئاشکرا، برجەقان، ڕۆشن. (باک.) ڕۆن، بۆ. شل، شلەمەنیە، کە پەیت وخەست نەبێ، چتی شل کراو.

**ڕووناس** (هەو.): ڕۆنیاس.

**ڕووناک:** ڕۆندار، گەورک، ڕەوشەن، ڕڤین، ڕۆن، ڕۆشن، ڕۆشنا، شوێنێکە تاریک نەبێ. ــ انە: کرێی کارەبا. ــ ایی: ڕووناکی، تاڤک. ــ بونەوە: ڕەوشەنبوونەوە، ڕەوشین. ــ کردنەوە: ڕۆشنکردنەوە.

**ڕووناکی:** ڕۆناهی، بینایی، بیناهی، ڕەمی، ڕۆژتیاتی، ڕەڤینی، ڕۆشنایی، ڕووناکایی، ڕۆنایی، قتشک، ڕۆژنایی، (باک.) بەلەدی، ڕەمی، سۆما، تەتشک. شۆقێکە بەهۆی ئەوەوە تاریکی لابچێ. ــ ی دان: قتشک ئاڤێتن.

**ڕووناهی** (باد.): ڕووناکی.

**ڕوونەبوون:** ڕوونەوەن، شەرم کردن.

**ڕوونەدان:** قوون تێکردن، ڕێزنەگرتن، ڕوولێ وەرگێران.

**ڕوون بوونەوە:** ڕۆشن و ئاشکرا بوونەوە.

**ڕوونبێژ** (باک.): تاوە.

**ڕوونبێژی:** زانیارێکە بەهۆی ئەوەوە بتوانرێ تاکە یەک مەبەست بە چەندین دەستە واژەی جودا جودا لێکبدرێتەوە.

**ڕوونشتاخ** (هەکا.): کۆڕ، کۆگە، کۆگا، دانیشتگە.

**ڕوونشتاندن** (هەکا.): دانیشتاندن، ڕۆنیشاندن.

**ڕوونشتەک** (باک.): کورسی.

ڕوونشتەک

**ڕوونشتەمان** (باک.): دانیشتوو، ڕۆنشتی.

**ڕوونشتگەه** (باک.): دانیشتگە، کۆڕ.

**ڕوونشتن** (باک.): دانیشتن.

**ڕوونشتی** (باک.): دانیشتوو.

**ڕوونڤیس** (باک.): ڕوونووس. ــ ی: ڕوونووسی

**ڕوونکردنەوە:** شێکردنەوە، ئاشکراکردن، ڕۆشنکردنەوە.

**ڕوونووس:** ڕوونڤیس، ڕوونوویس.

**ڕوونوویس:** ڕوونڤیس، ڕوونووس. ــ ی: ڕوونوویسی، ڕوونڤیسی.

**ڕوونێ** (زا.): دانیشە.

**ڕوونی:** ڕڤینی، ڕووناکی. شلی، تراوی.

**ڕوونیشاندن:** قایل بوون، پەسندکردن.

**ڕوو وەرگێڕ:** پشت تێکار، ناقایل.

**ڕوو وەرگێران:** ڕوولادان، پشت تێکردن، ناقایلی.

**ڕوو وەش** (هەورا.): ڕووخۆش. ــ ی: ڕووخۆشی.

**ڕوو وی** (باد.): ڕێوی.

**ڕووهاتن:** شەرم نەکردن لە ئاخۆتن و کرداردا.

**ڕووهەڵاوێژ:** زاتکار، پرکێش، پەردەی شەرم لادەر.

**ڕووهەڵاوێژتن:** زاتکردن، پرکێشان، برکردن، شەرم نەکردن، وازلە شەرم هێنان، پرکێشی کردن.

**ڕووهەڵچەرخان:** پشت تێکران.

**ڕووهەڵچەرخاندن:** ڕوو وەرگێران، پشت هەڵکردن، پشت تێکردن.

**ڕووهەڵچەرخاندن** (ئەردە.): ڕوو وەرگێران.

**ڕووهەڵماڵاو:** بێشەرم، بێ چاوڕوو. ــ ی: بێشەرمی، بێچاوەڕوویی.

**ڕووهەڵماڵراو:** بێشەرم، بێچاوەڕوو. ــ ی: بێشەرمی، ڕووهەڵماڵراوی.

**ڕووهێنان:** زاتکردن، پرکێشی، ڕووهەڵاوێژتن.

**ڕووهێنەر:** زاتکار، پرکێش.

**ڕو وی** (باک.): پرپشک و پزیشکی ئاوری.

**ڕوویاڵ** (باک.): ڕووت (بۆئەندام و دار).

**ڕوویت** (با.): ڕووت.

**ڕوویز** (باد.): گومان.

**ڕوویس** (باد.): ڕووت.

**ڕوویگ:** ڕۆیشتوو.

**ڕوویل:** (هەورا.) جوورە درووومانێکە سەرەکانی دووپارچەی بەیەکەوە دروراوە هەر یەکەی بەپانەوە بەسەر تەختی خۆیدا دەدروێن، ئەو جوورە درووومانە هی ڕووکاری ژوورەوەیە. کێوی، ڕەمەکی، ڕەوەک، ڕەوە، مێگەل.

**ڕوویمەت** (هەر.): ڕوومەت.

**ڕووین:** شۆفێر، ڕادەر، ئاژوەر، لێخوڕ. ــ ەر: شوفێر، ڕادەر، ئاژووەر.

**ڕووینگ:** (موک.، هەو.) تفتیلک، (هەورا.) ڕوویل، وورده تووکێکە دروای برینەوەی خوری مەڕان سەر هەڵدەداتەوە.

**ڕوویڤک** (باد.): ڕیخۆڵە.

**ڕوویل** (با.): جوورە دارێکی گچکەیە گوڵێکی سووردێنێ.

**ڕووین:** ڕۆیشتن، چوون، چووین.

**ڕووینەکوتا:** شکان، شکست خواردن، ڕەکۆسە.

**ڕووینەکفت:** ووشکبوون، سستبوون.

**ڕوونیشتن** (باد.): دانیشتن.

**ڕوویی:** (باد.) ڕوو، (ل.) ڕێوی، (هەورا.) ڕسان.

**ڕوویین:** ڕووان، بۆ ڕووەکێک بەکاردەبرێ، کەتازە پنجی داکوتابێ و سەری دەر خستبێ.

**ڕووینەوە** (ئەردە.): ڕەوینەوە، گەڕیانەوە، کشانە دوواوە لەترسان.

**ڕە** (باک.): ڕەگ. (زاخ.) ڕدین، ڕیش. ڕەگ وریشەی گیایان، ڕەگ، دەمار.

**ڕها:** ڕحا، ئورفە، شارێکی کوردانە لەنێوە ڕاستی ئامەد (دیاربەکر) و حەڵبدایە دانیشتووانی ئاوشار و دەورووبەری کووردن.

**ڕهتن** (باک.): ڕژتن.

**ڕهک** (باد.): شامی کەباب.

**ڕهکۆسە** (باک.): کۆسە.

**ڕهن** (باک.): شل. ــ ی: شلی.

**ڕهێل** (کە.): ڕەهێڵی بارانەی.

**ڕێ:** ڕێگا، ڕێگە، ڕێک، ڕیچک، ڕا، (فە.، دەر.) ڕی، بە ــ بردن: بەخێوکردن، پەروەردەکردن، بە ــ چوون: بەخێوبوون، بە ــ خستن:

بەرپێکردن، ڕێکرن، ناردن، ـــ بۆ دیتنەوە: (باک.) ڕێ لێ دیتن، هۆ دۆزینەوە، ژـــ شاشکردن: سەر لێ شێواندن، وەـــ کەوتن: بڕێکەتن، لەڕێ دەرخستن: تەفرەدان، ـــ گرتنە پێش: ڕێ لێبەرگرتن. بێ ـــ وجێ: بێسەروبەر، نارێک. مالْ، پارەیێکە لە بری زێڕ و جل و بەرگ یا لە جیاتی خوێن بدرێ بە مالّە بووکێ لە پێش گوێزتنەوەیدا. جار، چەل، نۆبە، نۆرە.

**ڕیا:** ڕوو، ڕووالّەتبازی.

**ڕێئۆل:** (باک.): بەرنامەییێکی جڤاتێکی کوردان بووە لە سووریە دەرچووە.

**ڕێئۆنی:** دادگەری، زانیاری، پشوودرێژی، ددان بە جەرگی خۆدا گرتن، پیتۆلی، ووتنی چتێک بەرانبەری ڕاستی کاروباری ڕاست ودروست، بە پێی بیروباوەڕی زانایانی ئیسلام ڕیئۆنی بریتییە لە پەی بردن بە کانگای چتان ئەویش دوو بەشە (علمی و عملی) ڕێئۆنی عیلمی، کە نظریشی پێدەلّێن زانیارانی دووای خۆرسک دەگرێتەوە، زانیاری لەبابەت خوداوە، زانیاری ریازی، ژمارە، ئەندازیاری، شایلۆغان، زانیاریانی خۆرسکی لەبابەت کان و ڕووەک و گیانلەبەرانەوە و پزیشکی و ئەستێرەناسی وچتی وا، حکمتی عملی بریتییە لە زانیاری ڕامیاری شاران و سەر پەرشتی خانەوادە و ڕێکی خووڕەفتار.

**ڕێبار** (باد.): باخ، هاوڕێ. ـــ ی: هاوڕێیی.

**ڕێباز:** بەرنامە. سەرەڕێ، ڕێگە، شوێنێکە ڕێگای بچێتەوە سەر و جێگای پێدا تێپەڕ بوونێیە.

**ڕێبازگە:** ئائین.

**ڕێبەدی کردن:** (بابا.): ڕێبەدییکردن، شارەزابوون، سەرلێ دەرچوون.

**ڕێبەدیی کردن** (بابا.): ڕێبەدییکردن.

**ڕێبەر:** (باک.) ڕابەر، ڕێگۆ، ڕێزان، ڕێ نیشاندەر.

**ڕێبەر:** ڕابەر.

**ڕێبەرخستن:** ڕێگایا کارێک خستنەبەر یەکێکی پێی گرانبێ.

**ڕێ بەرنان:** ڕێخستنە بەر کەسێکی، هاندانی یەکێک، کەکاری گەند بکات.

**ڕێبەری:** ڕابەری، ڕێگۆیی. ـــ کردن: ڕابەری کردن، نەڤچیتی.

**ڕێبەستن:** ڕێگاگرتن، پەکخستن، نەهێژتن.

**ڕێبەندان:** بەسترانی ڕێگایە لەبەر بەفر و بەستەلّەک و سەرمایە، (هەورا.) ڕاگیریای. ناوی مانگی نێوە ڕاستی زستانییە، کانوونا پاشی، کانوونا دووێ.

**ڕێبڕ:** سەرووەسی، جەردە، ڕاڕەو، ڕێگاو پێچەوە، ڕیچەبڕ، کەسێکە ڕێگا کورت بکاتەوە. ـــ ی: جەردەیی، ڕاڕەوی.

**ڕێبڕین:** ملی ڕێگا گرتن، بەڕێگایەدا ڕۆیشتن.

**ڕێبگار** (جا.): ڕێبووار، ڕاویار، ڕابگار، ڕەوونە، ڕێڕۆ، ڕێڕەو.

**ڕێبووار:** کەسێکە بە ڕێگایە دا بڕوات، ڕێوونگی، (باد.، باک.) ڕێوی، ڕوودی، ڕێڤینگ، ڕوو وی، ڕاویار، ڕۆیار، ڕایی، ڕاڕەو، ڕێڕۆ، ڕێڕەو، ڕیوینگ، ڕێبگار، (باک.) ڕیوینگی، ڕێبار، (هەورا.) ڕابووار، ڕێوار، ڕەوەن، ڕەوەند. ـــ ی تەنها: ڕێڤی، ڕیڤینگ. نێوی نێرینانە. ـــ ی: ڕاڕەوەی، ڕاویاری، ڕابوواری.

**ڕێبیر:** بیر و باوەڕێکە، کە مرۆ لەسەری بێ.

**ڕێ پاککەرەوە:** ڕێخۆشکەر، ڕێخۆشکار.

**ڕێپان:** (باک.): چاوەڕێ. لە ـــ بوون: چاوەڕێ بوون. ـــ ی: چاوەڕێیی.

**ڕێ پێبردن:** ڕێ بردنەسەر، دۆزینەوەی چتی نادیار و یا شاراوە.

**ڕێ پێگرتن:** چوونە سەر ڕێی یەکێکی بۆ بەگژدا چوونی و شەڕ پێفرۆشتنی.

**ڕێ پێگیر:** شەڕفرۆش. ـــ ی: شەڕفرۆشی.

**ڕێپێلکە:** ڕەپێلکە.

**ڕێتن** (باک.): ڕژتن، ڕیتن.

**ڕێ تێچوون:** ڕێکەوتن، لووان، گونجان. ڕێی تێدەچی، کە ئازاد لە دوواڕۆژدا بێتەوە سەر دۆخی مرۆڤایەتی ڕاستەقینە.

**ڕێ تێکەوتن:** ڕێکەوتن، هەلّکەوتن. دۆزینەوەی مەبەستی چتێکی نادیار بە ڕێکەوت.

**ڕێجێ:** (باک.) هەلّسووڕاندنی کاروباری کڕین و فرۆشتنی تووتنێ بەهۆی کاربەدەستانی دەولّەتی.

**ڕێچ** (باک.): ڕچە، باریکە ڕێگا، کوێرەڕێ.

**ڕێچە** (ئەردە.): ڕێژە.

**ڕێچەناس:** ڕێناس، ڕێزان، ڕێبەر.

**ڕێچک:** ڕێچکە.

**ڕێچکاکادزا** (باک.): ڕێگای کاکەشان.

**ڕێچکە:** ڕێچک، کوێرە ڕێ، باریکەڕێ، ڕێگایەکی باریکە زۆر ناڕووا دەبڕێ، ڕەوڕێلّە، ڕچەی سەر بەفری. ڕێزی مێروو لە ئاژالّ و مالاّت و هەموو جوورە گیانلەبەرێکی. ـــ بەستن: ڕچە بەستن، قەتارەبەستن.

**ڕێچکەبەستن:** ڕچەبەستن، قەتارەبەستن.

**ڕێچکەکردن:** ڕێچکەبەستن.

**ڕێحانە:** ڕیحانە، گیایەکی گەلاّپانی ڕەشی بۆنخۆشە.

**ڕێحانەکێویلە:** جوورە ڕیحانەییێکی دەشتی بۆنخۆشە.

**ڕێخ** (ئەردە.): زیخ، خیز. (باک.) ڕیخ. (کۆ.) گیایەکی زۆر بەهێزە مالاّت بیخوا دەیکوژێ. (ئەردە.) ووردەچەو.

**ڕێخەر:** لێخەر، لێخشین. ڕێکخەر.

**ڕێخەلّۆ:** ڕیخۆلّە.

**ڕێخت:** سروشت.

**ڕێختە:** ڕەختە.

**ڕێختمان:** ئەوکەرستەیە، کە چتی تێدا دادەڕژێ. دارا ـــ یکی باشی هەیە.

**ڕێخزار:** خیزەلاّن، زیخەلاّن.

**ڕێخستن:** لێخستن. ڕێکخستن، سەروبەرکردن.

**ڕێدار:** ڕێبووار.

**ڕێداگرتن:** مل لە ڕێگانان، بەڕێگادا ڕۆیشتن.

**ڕێدان:** ڕێگادان، ڕێگاکردن. مەیداندان، قۆلّکێشان، شەلەگەدان، خولّک، دەستوور.

**ڕێدەر:** مەیداندەر، قۆلّکێشەر.

**ڕێدەرکردن:** ڕێگادۆزینەوە.

**ڕێدران:** مەیداندران، دەستووردران.

**ڕێدراو:** مەیدان دراو، قۆڵ بۆ کێشراو.

**ڕێدوور:** ئامانجی دوور، جێگای ناهومێدی.

**ڕێدین** (باک.): چەنەگە.

**ڕێڕاز:** (باک.) بەرنامە.

**ڕێڕازنامە:** بەرنامە.

**ڕێڕەو:** ڕاڕەو. (کە.) ڕێبووار. ڕاڕەوی.

**ڕێڕۆ:** ڕێبووار. ڕاڕەو، ڕێڕەو. ڕاڕەوی، ڕێڕەوی.

**ڕێڕێ:** دێغ دێغ، دێخ دێخ، خەت خەت، تەنراوێکە، کە پۆیەکەی ناوبەناو جووت نەبووبێ.

**ڕێز:** قەدر، (هەورا.) پەری، پەزیرایی، پەرای، پەرە، پەز، پاس، (باک.) ئورد. بە ـــ : بەقەدر، قەدرگران، سەنگین. ـــ گرتن: ئوداگرتن، خەمناندن، قەدرگرتن، دکراندن، (هەورا.، زا.) خیز، چەو، (ئەردە.) ووردەبەرد. پۆل، ریز، تیپ، سان، ـــ بوون، ـــ کردن: لەساندن. ڕێژ، ئاورێز، ئاورێژ، (ئەردە.) قچ، قیچ، پارچەیێکی زۆر گچکە، بەش، چکێ، تۆزێ.

**ڕێزاڵ:** پارچەیێکی گچکەیە لەچتێک، هەلاهەلا، پارچە پارچە.

**ڕێزان:** شارەزا، بەڵەد، بەڵەدی ڕێگاوبان، ڕێناس. ـــ ی: شارەزایی، بەڵەدی.

**ڕێزە:** ئاڵقەڕێز. زنجیری باریک و درێژ، لاولاوە. ووردەی هەموو چتێکی، نەختێ لە چتێک. (هەورا. کۆن) لەش، بەدەن. (باک.) ڕێزەڵە (گیایەکە)، ڕیک، ئاگاداری. ـــ کردن: ئاگاداری دان. پایە، ئەندازە، ئازاد هێشتانەگەییشتۆتە ـــ ی پیاوان.

**ڕێزەخار** (ئەردە.): خیزەلان، زیخەجاڕ.

**ڕێزەخاڵ** (ئەردە.): زیخجار، خیزەلان.

**ڕێزەڕێزە:** هەلاهەلا، پارچەپارچە. (هەورا. کۆن) کەمکەمە، وورده وورده، ووردوهەراش.

**ڕێزەکە** (هەورا.): لاولاوە، ئاڵقەڕێز.

**ڕێزەڵە:** (باک.) ڕەزک، (کۆ.) توورەزەڵە، ڕەزڵە، ڕەزەڵە، (بابا.) توورەزەڵە، (ڕەوا.) ڕەزڕەزۆک، گیایە، کەبەتەڕی وکوتراوی لەسەر هەرجوورە برینێکی کۆن وتازەتەشەنە دار دابنرێ چاکی دەکاتەوە، بەووشکیش لەگەڵ ڕۆنی بۆ برینان باشە.

**ڕێزەڵۆک:** بەردێکە هەر لە خۆیەوە هەڵوەرێ.

**ڕێزەنان:** (هەورا.) وورتکەنان.

**ڕێزەوپێزە:** ووردەیێکە، کەلەچت دەبێتەوە، ووردەومردە.

**ڕێزەووڵ:** چتێکە، کەبەووڵین پارچەپارچەبووبێ، وورتکەنان.

**ڕێزەی ڕاز:** ڕازی نیهانی، ڕاز بەنهێنی و هێدی کوتن.

**ڕێزک** (باک.): چیرۆک، داستان، خوور، ڕەفتار، نەریت.

**ڕێزگر:** پەرای گەر، ڕاژەگەر.

**ڕێزگرتن:** پەرایکردن، ڕاژەکردن.

**ڕێزلانە** (ئەردە.): تۆزقاڵ، نەختێ، تۆزێ، ڕێزاڵێک لە چتێک، (ئەردە.) ڕێزۆڵە.

**ڕێزمان:** دەستووری زمان، ڕشیدکوردە بۆ زمانی کوردی داناوە.

**ڕێزۆڵە** (ئەردە.): ڕێزلانە.

**ڕێژ:** (باک.) خاوێنکردنەوە، ئەسترین. بڕێژ، ڕێژندە، داڕێژ، بەتەنهایی بەکارنابرێت، وەکو زبل ڕێژ، دەست ڕێژ. (باک.) گەسک. ـــ کرن: گەسک لێدان، ماڵشتن، سڕاندن.

**ڕێژاڤ** (باک.): تاڤگە، ڕێژاو.

**ڕێژان** (کە.): ژاندن، (ئەردە.) باران بارین. ڕژتنی شلەمەنی، ئاوەکەی ڕێژا، پیت، پێز، ڕێژەو.

**ڕێژاندن** (کە.): ڕژاندن.

**ڕێژاو** (کە.): تاڤگە، سوولاف، قەڵپەزە. جوورە هەنجیرێکە.

**ڕێژە:** (ئەردە.) بەردێکە شووشەی لێدروست دەکرێ. ڕیجە. (ئەردە.) بۆتە.

**ڕێژەر:** داڕێژەر.

**ڕێژەن:** فەڕ، پیت، بڕشت، خەڵەی ئەمساڵی کوردستان بە ڕێژەنە.

**ڕێژەو:** فیچقە، خوڕ، لووزەو، ڕێژنە، بارانێکی تووشە، ـــ ی بارانە: تاوی بارانە، بە ـــ هاتنە خووار: بە خوڕهاتنەخووار، پیت، پێز.

**ڕێژتن:** ڕژتن.

**ڕێژران:** ڕژان.

**ڕێژراو:** ڕژێنراو، ڕژاو، ڕژانراو.

**ڕێژگاو:** (بابا.) گەوج، کەسێکە بە شووێن مەبەسێکی هیچ و پووچدا بگەڕێ. (کە.) سوولی، سوولاف، تاڤگە، پڕژ، وەزەن، ڕێژگە، دێلاف.

**ڕێژگاوی:** خەرزیی و دوواکەوتنی چتی هیچ و پووچ.

**ڕێژگە:** شووێنی ڕژان، جێگای داڕژان، ڕێژگاو.

**ڕێژنای** (هەورا.): ڕژتن.

**ڕێژنە** (هەورا.): ڕێژەو، پیت، پێز.

**ڕێژنەی بارانە:** ڕەهێڵە، خوڕڕەمەبارانە، (هەورا.) لێزمە، ڕشێنەبارانە گوڕێک دەبارێ و دەڕوا.

**ڕێژنەی گوللان:** شێلنگ، دەستڕێژ.

**ڕێژوو:** ڕەژوو، ڕەژی، خەڵووز، ڕێژی.

**ڕێژی:** ڕەژوو، ڕەژی.

**ڕێس** (کە.): ڕیس، ڕیسراو. ئەستوورایی مل: پێی نایە ـــ ی ملی، تیەن. (باک.) گەسک.

**ڕێسان:** ڕستن.

**ڕێسە** (ئەردە.): ڕستن.

**ڕێسەر:** بەن ڕێس، ڕێسەر، ڕێسەمان.

**ڕێسەمان** (کە.): ڕێسەر، بەن ڕێس.

**ڕێسپی:** ڕیش سپی، گەورەی دێ.

**ڕێستن، ڕستن:** بادان، ڕێسین، ڕێسە، ڕیسین، ڕێسە.

**ڕێسران:** ڕێستران، ڕسران، باودان.

**ڕێسراندن:** (بار.) پشت لە مرۆڤ یالە وولاخ کردن تالەبەربێ ڕاژەیی لەڕو لاوازبێ.

**لووت هاتنەخوار:** لووت پژان.

**لووخانە** (کە.): بەزم، ناهەنگ.

**لووجاندن** (باک.): کلک جوولاندن، بلیجیینە.

**لووچیین** (باک.): کلک جوولان (بلوورچە).

**لوخت** (فە.): ڕووت.

**لوور** (ڕەوا.): پندربوونی زوبان و زارەدرای چێژتنی زاخییە.

**لوڕ:** هۆزێکی گەورەیە، دوو بەشە: لوڕی گچکەو لوڕی گەورە ئەوانە هەمووی چوار لکن: لوڕ، لەک، شوان، بەختیاریی.

**لووچکاندن** (باک.): بەرگ داکەندن، پێستی تەنک لێ کردنەوە. بلوورچکیینە.

**لووچکیین** (باک.): پاک کردن، تیکوول لێ کرانەوە.

**لووراندن:** لووڕین، کووزیین، زووریین، بۆ سەگ و گورگ بەکاردەبرێ، لورلاندن، لیراندن، لیریین.

**لوورە:** ـــ ی سەگی و گورگی، لووریین: جێگا، (دەر.) لوولە. (کە.) جوورە کورتانێکە.

**لوورەلوور:** نێوی دەنگی سەگی و گورگی و چەقەلییە کە دەلوورێنێ، (دەر.) لوولەلوول.

**لووڕی:** جوورە کورتانێکە، کورتانۆکەی دووفلیقانە.

**لوڕستان:** (فە.) لوڕسۆ.

**لوڕسۆ** (فە.): لوڕستان.

**لووڕک** (هەو.، کۆ.): ژالە.

**لووریین:** لووران.

**لووزەو** (شار.): ڕێژنە، (موک.) ڕێژەو، بەلێشاو هاتنەخوارەوەی ئاو لە گۆزە ویا دەغڵ لە کەندوو و ئیدیی.

**لووس:** منداڵی ـــ : منداڵی بێ تووک. لووس بوون، لووس کردن: فەرتاندن، شاییک، شاهییک. (باک.) حوولی، هلوو، هلووس، هییت، پووس، تاس ولووس، لووس وپووس، شووت. تەواو، هەموو، ـــ کردن: شاهین کردن، شلالە: شابیک کردن.

**لووساوک:** سوولاوک، پلووسک.

**لووساوکە بەستن:** ـــ ی خووێن: خووێن بە جۆگە هاتنەخوارێ.

**لووسکە:** نێرینەی حیز، ـــ بازی: نێربازی.

**لووس و پووس:** تاس و لووس.

**لووش** (باد.): کولیێرە.

**لووشاندن:** هەڵ لووشینی بە کەپۆ.

**لووشە:** (ڕەوا.، خۆ.) لیشمە. (باد.) لووشک. چڵە گیایەکە وەکوو سێ پەلکە وایە لە بنەوە وە پیوازی دەچێ مەیلەو سوورە نێزیکی ئەمژنۆیێک بڵندەو لەسەرییەوە ٥٠ ـــ ٦٠ گوڵێکی گچکەی وورد وەکوو دەسکەگوڵی دەردەکات، سوورێکی سپی پاتە لە دژکوڵیویی دەکەن. (کە.) گریان.

**لووشەلووش:** وولاخ کە جۆی بیینی ـــ ی دەکات، (دەر.) حرمەحرم، فووشەفووش. لووشەی کەر و ئەسپ و مایین، خرماندن. فیشکەفیشک: گریان، فووشەفووش.

**لووشدان:** ـــ بە دووپێیان: جووتە، جفتە.

**لووشکە:** جیفرکە، لەقە، لووشکەناوێژتن: جووتە ئاوێژتن. لووشکە لێدان: لەقە لێ دان.

**لووشکەلووشک:** حرمەحرم.

**لووشیین:** هەڵ لووشین.

**لووغمە** (موک.): قایشێکی درێژە لە زیندا ئاوزەنگی پێوەکراوە، زەخمە.

**لووفک** (باک.): لفکە.

**لووگی:** خووێری، (ڕۆژ.) خۆر، بەدەستی بەتاڵگەڕ.

**لوول** (باک.): حەیزەران، خیزەران.

**لوولاک:** (باد.) دروێشی، ئێسکی بەڵەکییە، مووچە، (ڕەوا.) سپیلکی پێ.

**لوولاق:** پیپر، (باد.) چۆقڵ.

**لوولاندن** (کە.): لووراندن.

**لوولە:** ـــ گۆزە و ئیتر، ـــ ی تافتەو ئیتر، ملوانەیەکە بەسەر سنگدا شۆڕێتەوە و بگاتە سەر هەیاسە، (باک.) بەریانگ، ـــ ی ئاسن: تیرک، ـــ ی تفەنگی هەرچی بێ، باڵۆڵ، (باک.) بۆرییک، بۆریی، کووریۆڕی، گێسیین، داریی زۆر ئەستوورە دەکرێتە تەختە، (هەورا.) باهور، ـــ ی خاوێن کردنەوە: مرازێکە لە کەرەستەی جۆلایی. لوولەکردن: خەفیزۆک، ـــ ی دار: (باک.) بۆت، ـــ ی چکۆڵە: دارۆپی، لوورە.

**لوولەلوول** (دەر.): لوورەلوور.

**لوولەپەر** (باک.): شەپۆلدار، زینەتدار.

**لوولەجەگەن:** جوورە جەگەنێکە بێ گرێ و گوڵ و لووس هەڵدەچێ و لەسەرەوە گوڵێکی دەردەکات، نێوی پووکە (پووچە) بۆ کورتان و ئالاشی خانوان دەست دەدا و پێش بەندانیشی پێ دەگرن.

**لوولەلوول** (کە.): لوورەلوور.

**لوولە هێن:** مەسینە، ئافتاوە.

**لوولەیی:** وەکوو لوولە.

**لوولدان:** تێکەوەپێچان، وەرپێچان، (باک.) تاپان، پێچانەوە. (باک.) یەکێکە لەمرازی کەرەستەی تەونی، (دەر.) لوولکە، پەلوو (چێشتێکە).

**لوولک** (باک.): لوولەی گۆزە یا کووپە، (کۆ.) لەیلووک، لەلووک، پنچە گیایەکە گەڵای پانە بەڵان وەپیوازی دەچێ.

**لوولکە** (خۆ.): جوورە دێمکەیەکی ئاوییە قامیشێکی تێ خراوە. (کۆ.) لورلوو، نی جۆلایانە.

**لوولوو** (بابا.): (کۆ.) لوولکە، نی جۆلایانە.

**لوولووپەڕ:** گیاییکە لە ئاوی ڕاوەستاودا دەروێ بنی وەکوو گێزەرییە لاسکی لووسە بڵند هەڵدەچێ کە گەیشتە ئاستی سەر ئاوەکە گەڵاو گوڵ دەردەکات. لەیلووپەڕ، نیلووفەر.

**لوولی** (هەورا.): بلوێر لێدان. ـــ ژەن: بلوورلێدەر.

**لوولێنە:** گزسکە.

**لوونگ** (زەن.، کەل.): فۆتەی گەرماوییە.

**لووێچ:** پڕ بە دەستێکی درێژووکە کراوە. لاویچ، (باک.) جەلک.

**لوێنه** (زەن.): ناشەوان.

**لوویی** (کە.): لوو.

**لوویت** (کە.): لووت، کەپۆ.

**لووێته** (فە.): ڕووت.

**لویس** (کە.): لووس.

**لویشکه** (کە.): فیشکەفیشکی وولاخە کە داوای ئالیکی بکات.

**لویشکاندن** (کە.): لووشەلووش.

**لها**: نێرە.

**لهفه** (باک.): جوورە پێچێکە، مێزەر.

**لهوّن** (هەورا.): پارچە خاکێکە لە هەوراماں کە بەشێکی کەوتۆتە عێراق و ئەویدی کەوتۆتە ئێرانەوە.

**لێ**: لە ئەو: لێیم وەرنەگرت: لە ئەوم وەرنەگرت. لێ وەرگرتن: لە ئەو وەرگرتن، لێ دروان: لە ئەو دروان، لێ دان: لە ئەودان. ئەوێ کەسی لێ نەبوو. ـــ بوور: بەخشەر، چاوپۆش، ـــ بووردن: بەخشین، چاوپۆشی. چونکە. (باک.) ئۆغ، بەلاّن، بۆیە، چونکو. لەکاتی قسەکردنی لەگەلّ ژنان بەکاردەبرێ.

**لیانی** (هەورا.): هێلانە.

**لیان**: جوولاّن.

**لێ بەربوون**: تر، تس کەندن. دەست لێ بەربوون، کۆتایی بە کاردان.

**لێ بەشکراو**: بەسەردا بەشکراو.

**لێ بەش کردن**: بەسەردا بەشکردن.

**لێ بڕان**: ئارەزوو، خەبات، حەزکردن. کورتی هێنان، کەم وکورتی تێ کەوتن.

**لێ بڕاوبوون**: خەریک بوون، بڕیاردان، خۆش بوون.

**لێ بردن**: تێراکردن، تێرۆکردن.

**لێ بووەوە**: پەڕیو.

**لێ بوورەر**: بەخشەر، چاوپۆشی کەر.

**لێ بوردن**: بەخشین، چاوپۆشی، خۆکردنە قوربانی، وازلێ هێنان.

**لێ بووردوو**: لە خۆ خۆشبوو، فیدایی.

**لێ بوورین**: بەخشین، لێ بووردن، چناویەرد، لێ وەروونەهێنان، بوورین، بەسەر چوون، وەرِوونەدانەوە.

**لێ بوون**: لێوەبوون، وەبوون.

**لێ بوونەوە**: لێک بوونەوە، جوێ بوونەوە، پەڕاندراو، لێ فرێدراو. تەواو بوون، تەواوکردن، لە کار بوونەوە، کۆتایی بەکاردان. گەلاّ لە داربوونەوە، لێک جوایز بوونەوە.

**لێپ**: فێلّ، فریو، (باک.) فەرەج.

**لێ پرس**: پرسیارکەر. لێ پرساو، بەرپرسیار. پرسکەر، پرسیار.

**لێ پرساوی**: بەرپرسیاری.

**لێ پرسین**: پرسیار لێ کردن.

**لێ پیس کردن**: نەخۆشییەک، کە تەشەنە بکات و چاک نەبێتەوە.

**لێپۆک** (باک.): قەشمەر جاڕ، شایانی قەشمەری. (باک.) ـــ ی: قەشمەر جاڕی.

**لێ پێچانەوە**: سۆراغ کردن و پرسیارکردنی چتێک.

**لێپوو** (فە.): لێوار، کەناری ئاو.

**لێ تێک چوون**: بەسەرچوون.

**لێج** (باک.): لیچ.

**لێچەک** (هەورا.): لەکی پێچی سەری یا چتێکی لە گەردن ئالاّندن.

**لێچوو**: موشەبیەهـ (ڕەوانبێژی).

**لێ چوواندن**: وێ چوون، تەشبیەکردن، وێچواندن.

**لێچوون**: دەلاّندن (بۆ ئاو)، ڕەنگ و چڵک لەبەر ڕۆیشتن. (کە.) وێچوون.

**لێخەفتان**: بە تەنگەوە بوون، هەولّدان. لێ نەخەفتان: سەرسەرەکی.

**لێخراو**: لە کار دەرکراو.

**لێخرێنەوە** (باد.): شەمچە.

**لێ خستن**: لێ خشاندن، (باک) کوتان، لێدان (لێخە).

**لێ خشان**: لێ خران.

**لێ خشاندن**: لێ خستن.

**لێخن**: شلوێ، شێلوو.

**لێ خۆشبوون**: لێ بووردن.

**لێدان ڕۆیشتن**: سەری خۆ هەلّگرتن و ڕۆیشتن.

**لێخوران**: ئاژووران، ڕاتران.

**لێخورە**: باژۆ، بڕان.

**لێخورین**: ئاژۆتن، ڕادان، ڕاناندن. (دەر.) ڕانان.

**لێدان**: هەرشاندن، هەرستاندن، (هەورا.) مەژەند. چت بە دزی شاردنەوە.

**لێ دراو**: کوتراو. (باک.) هیلە.

**لێ دەرکردن**: تەرح (ژمارە).

**لێ دان**: (دەر.) بالەی، کوتەکدان، تەپ کرن، (باک.) تەپساندن، ژەناندن، ساتن، گەش، شاناندن، شۆپ.

**لێ دوو**: چەرپاندن.

**لێ دووان**: شەن و کەوکردن، تەنقیدکردن، تەوس لێ دان. لێ ئەکۆلان.

**لێڕ**: لێڕەوار، جەنگەل، جەنگەلستان، دارستان، بێشەلاّن.

**لێر** (فە.): لیبیک، ئاوی زار.

**لێرە**: (باک.)ئێرەهە، لەئێرە، لوێرە. لێرەیە: لەئێرەیە.

**لێزان**: زانا.

**لێ زانین**: زانین.

**لێزم** (باک.): خزم.

**لێزماو**: سەیل.

**لێزمە** (هەورا.، شا.، زەن.): خورەمە باران، ڕێژنە.

**لێزمتر** (باک.): خزمی دوور.

**لێزمتی** (باک.): خزمایەتی.

**لێزین** (باش.): گەپ، گەمە، یاری.

**لێـژ:** نشێو، جێگـای سـەرەوژێر، سـەرەبەرەوخوار. ـــ وە بـوون: سەرەوژێربوون.

**لێژاو:** ئاوێک، کە لە شوێنێکی بەرز لێژ بێتەوە خوارێ.

**لێژایی:** نشێو.

**لێژەلێژ:** کۆمەڵەداری لەسەر یەکتری دانراوە.

**لێژنە:** دەستەیەکە لە چەند کەسێک پێک دەهێنرێ بۆ لێکۆڵینەوە و بڕیار دان لەسەر کارێک.

**لێسان:** لستن.

**لێسانەوە:** لستنەوە.

**لێسە:** جۆی سووێرو برژاوە لە جیاتی خووێ دەدرێ بە ماڵاتان. ماڵە، ماسنج.

**لێستە:** لزگە.

**لێستن:** لێسان، لێسی، لستنەوە.

**لێسکە:** مرازێکە ناوی کەوچکی داری پێ لووس دەکرێت لەدووای قووڵ کرانی لەباتی ڕەندەی.

**لێستنەوە:** لێسانەوە، لێسینەوە.

**لێشاو:** لافاو، سیلاو.

**لیبیف:** داری خورما تووێکڵێکی سووری تەنک فڕێ دەدا خەڵک بەکاری دێنێ بۆ شووشتنی قاپ و قاچاخ لیبیفی پێ دەڵێن. لێف.

**لێفە:** لێفەشڕ، لیبیڤ، مێشرەف، ئۆیەر (ئی سەرەوەیە) (باک.)، ئۆیەری (ئی چکۆڵەیە).

**لێڤ** (باک.)**:** لێو، کەنار، لێڤائاڤی: کەنارئاو، لێڤاچیێ: کەناروبن چیا، لێڤاسۆلی: لغاوی کەوشی. سەرلێڤ کرن: بەسەری لێوان ئاخەفتن.

**لێڤۆک** (باک.)**:** لێپۆک، قەشمەرجاڕ.

**لێ قەوماو:** بەدبەخت، خاکەسار، خەمناک، چارەڕەش، بەسەزمان، بەستەزمان. هەژار، بێچار. تێماو، ناچار.

**لێک:** لە یەک، لەیێک، لێک دابڕان: لە یەک هەڵبڕان. لێک بوون: لە یەکتری زیزبوون.

**لێک بوون:** لێک جووێ بوونەوە.

**لێک بوونەوە:** جووێ بوونەوە، دووپارچە بوون.

**لێک بڕان:** لێک دابڕان، لێک جودا بوونەوە.

**لێک لادان:** خۆ تەریک کردنی دوو کەس بۆ ئەوەی بەرەو ڕووی یەک نەبن.

**لێک کردن:** لەیەکتری جوداو زیزکردن، دوو خۆشەویست لێک جووێ کردنەوە، بێ بەش کردن، بەری کردن، وێک چوون.

**لێک کردنەوە:** لەیەکتری جووێ کردنەوە، دووکەسی شەڕکەر لێک جووێ کردنەوە، جووێ کردنەوە.

**لێک پەترکردن:** مزایەدە. زیادکردنی نرخ.

**لێک نێخستن** (باد.)**:** بەشەڕدان.

**لێکدابڕان:** لێک بوون، هەڵبڕان، دوور کەوتنەوە.

**لێکدالێک:** یەک لەسەر یەک.

**لێکدان:** د بەر هەڤدان، دوو یا چەند کەسێک لە یەکتری بدەن.

**لێکدانەوە:** فەلسەفە، بەراوردکردن، لێ ووردبوونەوە، ـــ ی دەنگ و باس. ڕاڤە کردن.

**لێک کراو:** بەشخوراو، بەشبڕاو، بێ بەش، هەڵبڕاو.

**لێکەوتن:** عەزل بوون، هەژاربوون، وێکەوتن، لە پایەو پاسایان بوون.

**لێ کەوتنەوە:** هەژاربوون.

**لێ کەوتوو:** هەژار.

**لێک خشان:** بە یەک کەوتنی ڕووکەشی دوو شت.

**لێک خڕان:** لە یەک هەڵبڕان.

**لێکچوون:** بە یەک چوون.

**لێکچوو:** بە یەک چوو.

**لێک خستن:** لێکدانی دوو چت.

**لێک دوور کەوتنەوە:** لێک هەڵبڕان.

**لێکەوت:** شایان، لێوەشاوە.

**لێک فەکرن:** لێک کردنەوە، دابەشکردن.

**لێک کردن:** لە یەک کردن. (بابا.) وێکچوون.

**لێکراوەوە:** پەڕاو، پەڕاندراو.

**لێک کەوتن:** بە یەک کەوتن.

**لێک کراو:** بەشخوراو، بێ بەش، بەش بڕاو.

**لێ کردن:** بارکردن، بێ بەش کردن، عاجزکردن، دەغڵ لە ئاش کردن، هاڕین، لە ئاو کردن: نەهێشتنی ئاو بخواتەوە. ڕێچوون، پێچوون.

**لێ کردنەوە:** پەڕاندن، پچڕین، پچڕاندن، لێ فڕێدان. ـــ ی گوڵ و میوە: چنین، چنینەوە.

**لێک نران:** قوچان، چوقان.

**لێک نان:** قوچاندن، تترووکاندن، داخستن، چوقاندن.

**لێک هەڵبڕان:** ترازان.

**لێک هەڵبڕین:** ترازاندن.

**لێک هەڵوەشان:** لەبەر یەک چوون.

**لێکۆڵینەوە:** وێ کەوتن، لێ قەکۆڵان، ژێر و ژێر ئانین، لەبنچینە دەرهێنان.

**لێ گەڕان:** وازلێ هێنان، بەردان، بەرەڵاو ئازاد کردن، بەلاوەنان. وە شوێن کەوتن، لەدوو گەڕان، وە دوو کەوتن، لێ گەڕیان، لپەی گەڕیان، پێڕەگەڕیان.

**لێ گەڕاو:** وازلێ هێنراو.

**لێ گرتن:** ڕەخنە گرتن، بەژاقیت، عەیب لێ دۆزینەوە، هەڵبژاردن، لێ ژمارکردن، لێم مەگرە: بە عەیبی مەزانە لە من.

**لێ گرتنەوە:** تەنینەوە، لێ بڕین.

**لێ گۆڕان:** گومڕابوون.

**لێڵ:** تێکڵ، شلوێ، شێلوو، لێڵ بوونی هەوا، لیخن.

**لێڵ بوون:** شێلووبوون.

**لێلات** (باک.)**:** پان، تەراز.

**لێلاڤ** (باک.)**:** شلێوە، باران و بەفر بە تێکەڵاوی هاتن.

**لێلاو** (هەورا.): شلوێ. ــ ی: ئاڵۆزی و شێوانی چاو.

**لێلایی**: کوێرایی، (لێلاییم گاتێ).

**لێڵ** (جا.): لەگەڵ.

**لێ لێ** (شکا.، جز.، نەهـ.): کەسانی مێیینـەی پێ بـانگ دەکرێ، جووره گۆرانییەکە.

**لێم**: لەمن.

**لێمان**: لەنێمـە. خواردنێکـە هـەزم نـەکرێ و ببێتـە هـۆی نەخۆشی دەڵێـن لێمانیتی.

**لێمشت** (باک.، سۆ.، هەو.): لافاو وسێلاوی قوڕاوی.

**لێمۆ**: لییمۆ.

**لێنان**: ئامادەکردنی چێشت.

**لێنیی** (باد.): لێنراو، چێشت.

**لێنگیز** (ڕەوا.): چۆڕاوگەی ئاوێیە، ئاو لەبەر هەر چتێکی بڕوا. (شا.) تۆفان، سێلاو، بارانێکی بە خوڕەم ببارێ، هەستانی ئاوە.

**لێو**: لیف، لچ، لەواسە، لەو، بە ژێر ــ کردن: شاردنەوە. قـەراغ، کـەنار، لێوار، (هەورا.) دەلق: چتێکە وەکوو (خەرقـە) وایـە. لێـو ئەسـتوور: لـچ قەوی.

**لێوە** (قوتبەیی، ڕۆژ.، کە.، فە.): فرۆی شل، شیری ژەک بـەکوڵاوی، کـە شل بێ لێوەیە، کەتوند بێ کەرەیە. شێتی، فێ، لێودار، لێوپاک: فێدار.

**لێوەبوون**: لـێ بوونەوە، تەواو بوون، لێک جووێ بوونەوە.

**لێوار**: قەیار، کەنار، قەراغ، ڕۆخ، دەماوەڵ، ڕووخ.

**لێوان**: پەرداخی ئاو.

**لێوەخۆ کەوتن**: خۆ بۆ ئامادە کردن.

**لێوەرگرتن**: شت لـە یەکێ وەرگرتن.

**لێوەستان**: تەماشا کردن.

**لێ وورد بوونەوە**: بەراورد کردن، سەرنج دان.

**لێوڕێژ**: لەسەر ڕژانەوە، ــ بوون: ترهان، ــ کردن: ترهاندن.

**لێوستان** (دەر.): نۆڕیین، تەماشاکردن.

**لێوەشان**: لێهاتن، لایەق بوون.

**لێوەشانەوە**: بەژمێر، توانا، لێهاتن، ژێ هاتن.

**لێوەشاندن**: لایەق پێ دیتن.

**لێوەشاو**: لێهاتوو.

**لێوەلەرە**: لێوە لەرزە لە سەرمان یا لەبەر گریان.

**لێو ئەستوور**: لچ قەوی، لچن.

**لێوەلەرزە**: لێوەلەرە.

**لێ هاتن**: لـێ هەڵاتن، گان کردنی مـاڵات و وولاخانـە، لـێ وەشانەوە، ژێ هـاتن، (هـەورا.) دومبەڵێکـە لـەنێو زگـدا پـەیدا دەبـێ ئەگـەر تـا ٢٤ کەژمێران نەیکوژێ پێ نامرێ.

**لێ هاتوو**: لێوەشاوە.

**لێ هەڵاتن**: لێ هاتن (گان کردنی ماڵات و وولاخ)، لەدەست فیرار کردن، ئەستێرەی بەخت درەوشانەوە.

**لێ هەڵسوون**: تێ هەڵسوون، سووین.

**لێ هەڵگەڕانەوە**: بادانەوە، پەشیمان بوونەوە.

**لێ هەڵگەڕاندنەوە**: پێ بادانەوە، پەشیمان کردنەوە.

**لییان** (هەورا.): کونێکە لە دیوارێدا لە زستاندا میـوەی تێـدا هـەڵدەگرن و زاری دەگرنەوە، بۆ هەموو جێگایەکی ئەو تۆ بەکاردەبرێ کە میـوەی تێـدا بشاردرێتەوە.

**لییاو**: شەپۆڵ.

**لییپ**: لزگە، سێ ــ: سێ لیزگە.

**لییان**: پڕبوون.

**لییاولییپ**: پڕاوپڕ.

**لییۆر** (کە.): لمبۆزی بەراز.

**لییۆک**: قەشمەرجاڕ.

**لییت** (هەورا.، فە.): لووت، کەپۆ، پت.

**لییتاف** (باک.): لیتاو.

**لییتاو**: (باک.) لییتاف، لییتە، قوڕاوێکی شلە.

**لییتە**: قوڕێکی زۆر شلە، لییتاو، بێرم.

**لییتۆکە** (باک.): پیس، ناپاک.

**لییچ** (هەو.): لییچق، چتێکە شل وگربێ.

**لییچاڵ**: مورەببا.

**لییچق**: چتێکی شلە بەدەست و ئیدیکەوە دەزووڵە بکات و بیگری. لنج، (هەو.) لیچ، لییچ، لیینج، (کۆ.) لیینچق، (هەورا.) لینجاو.

**لییر**: کەمۆرانە بە لەشـی مرۆیـدا هەڵگـەڕێ یـا بیگـەزێ قنچکەیـەکی لـە لەشـی مـرۆی پـەیدا دەبـێ دەرنـابێ و دەڕەوێتـەوە. (ژەن.) لـیر، (ڕۆژ.) لرگ.

**لییراندن** (باک.): لووراندنی گورگی و ئیدییە، بلوورینە.

**لییرین** (باک.): بلییرە، لووراندن.

**لییرە**: سکەی زێڕە، لیرا.

**لییزوان** (باک.): گەمەکەر.

**لییژنە** (شا.): گزرە، گیشەدار، تایەی دار.

**لییس** (بابا.): لییسی کوێری: شـەڕی کوێرانـە، داپڵۆسـین و لێکـدان. کۆترخـان، (بـاک.) ئـەنزێل. (کـە.، جـا.، مـەر.، بـاد.) کووتـەک، (کۆ.) مرخە، داردەستێکی ڕاستە کە هیچ سەرێکی خووار نەبێ. لیس لێدان: بە کووتەک لێدان. (باک.، هەو.، ڕەوا.) هێلانەی کۆترانە لـە بن گوێ سووانانی دروست دەکەن. (ڕۆژ.) جقە، هێلانـەی مریشکانە لەسەر دارو پووش و هەڵاشی دروست دەکەن جێگایەکە پێویستە بڵندبێ.

**لیساندن** (باک.): باڵندە دە هێلانەکردنەوە، بلیسیینە.

**لییسە**: لزگە.

**لییسک** (هەورا.): زەنگەتەی ترێ. (ژەن.) تیشک، ــ ی خۆر.

**لییسۆکە** (شار.): بەردێکی پڕ بـە چنگییـە یا بـە قـەدەر هەنارێکییـە کـە لووس بێت.

**لییسهان** (باک.): هەڵنیشتنی باڵندانە لە هێلانەدا یا لەسەر لکی داران.

**لییشمه** (جا. ، خۆ. ): لووشه (گیا) ، خشت وخاڵ، چرپ وچاڵ.

**لییفەڕوو** (فە. ): ڕیخۆڵە.

**لییف** (دەر. ، باک. ، کە. ، ڕۆژ. ): لێفە، بژیی گیایانە، تیکوولّی دارە خورمایە کە سووک و تەنکە قاپ و قاچاخی پێ دەشۆرێ.

**لییفە:** لفکە.

**لییفک** (باد. ): کودورولییفکە، کووکەلەی زەرد.

**لییفکە** (هەورا. ): لفکەی خۆ پێ شوشتنێ، (باک. ) لییفک. لفکەی پێچانیشە. (هەورا. ) لفکە.

**لییفۆک:** لیبۆک، هەزەلی.

**لییق** (بابا. ): لییچق.

**لییقە:** ــ ی مەرەکەبی.

**لییقەلییق** (باد. ): قاقای پێکەنینی.

**لییک:** بزاق، بۆراک، ئاڤدم، ڕیینگاو، ئاوی زار، لییگاو، (باک. ) چڵم، ئاوی کەپۆە.

**لییکاو:** ئاڤدم، لیک.

**لێکردنەوە:** میوە لە دارکردنەوە. دوو یا چەند چتی پێکەوە نووساو لێک جووایەز کردنەوە.

**لییکن:** لرگاو.

**لییل** (باک. ): جوورە دوورپشکێکە. پێستی داری، تیکوولّی داری. ــ کردن: پاک کردن.

**لییلاڤ** (باک. ): قوڕێکە تێکەڵ بە بەفری تواوەوە بووبێ، لۆرخ.

**لییلک** (باد. ): هەڵووک. (کۆ. ، باد. ) قایشی چیغیە.

**لییلووپەر:** نییلووفەر، بەنونی.

**لییم** (موک. ، باک. ، سور. ، فە. ): قەوزەی ئاوی. دارێکە. لیمۆ، لیمۆن. نێوی ئافرەتانە.

**لییمدار** (موک. ): (هەو. ) لییودار. (باک. ) بسیلکەک.

**لییمانە:** گرییمانە، بڵییمانە. ئەو تەڕاییەیە کە لەگەڵ کارو بەرخان دەبێ، تەڕایی کارو بەرخانە دووای بوونیان بۆ منداڵیش بەکاردەبرێ وەکوو چڵم وایە. میینای دەریایانە، یانی جێگای بە لییم، جێگای لییمدار، لیمدار.

**لییمۆ:** ترنج، ترنجۆک، دارێکە بە بەرەکەشی هەر لیمۆ دەڵێن.

**لیینە** (زێ. ، ئاک. ): کووپەی ئاوی.

**لیینجاو:** لییچق.

**لیینج** (ڕۆژ. ): لییچق، چەسپ وەکوو چەسپی چریش و ئیدی.

**لیینجق** (کۆ. ): لییچق.

**لیینجی:** لنک.

**لیینگ:** لاق، لنک. تاوەی چێشتی.

**لیینگە:** لنگە.

**لیینگەفڕکە:** لنگەفڕکە، لاق لە زەوییەوە وەژاندن، منداڵ لە زیزبوونێدا و مەڕو بزن و ئیدیکە لە سەربڕینێدا.

**لیینگدان:** غاردان، بەزیین.

**لیینی** (هەورا. ): ماڵی، کەوی، خانەکی.

**لییو** (بابا. ): لییمی وورد، خیزیی وورد، لم. ــ دار: لییمدار. بسیلاک.

**لییوان** (باک. ): داڵان، هەیوان، پێشخان، لیوان.

**لییوە** (زمن. ): شیپ، دیوانە.

**لییویی** (هەورا. ): وەرگەڕاو، سەرەوژێر.

**لیی یان** (باک. ، شەم. ): کەوشی دارە لەسەر بەفریی پێوە دەڕۆن. ما. (فە. ) مێ.

**م:** تیپێکی ئابێی کوردییە. (باک. ، شکا. ) مـن (تەنها بۆ تیپەڕ بەکاردێ) ، م داتە: من دامە تۆ، م گرت: من گرتم. م کوت: مـن گوتم. م: ڕاناوی لکاوی: دەستم.

**ما** (دزە. ، خۆ. ، باک. ، بار. ، جا. ): چیا، ئایا. چما، ئەرێ؟، ما بڕوا چییە؟، بۆچی ئەگەر بڕوا چییە؟، ئەرێ ئەگەر بڕوا چییە؟، بۆچ، لۆچی؟، چی، ئەدی. مێ، کارەمایە: کارەمێیە. ئەدی، ما نایەوێ: خۆ نایەوێ. ما چ بکەم؟: ئەدی چ بکەم؟. غارو هۆلی مەراز. (پژ. ) بۆ، بۆچی، ما باکەی؟: بۆچی بانگ دەکەی؟.

**ماء:** بالاّندنی بەرخانە. ــ کردن: بالاّندن.

**ماء ماء:** بالەبالی بەرخانە.

**ماپارە:** نێوی ئافرەتییە.

**مات** (موک. ): بەپەرۆش، پەرۆشدار، کز. ــ بوون: پەنگ خواردنەوە، هەست لە خۆبڕین، چرچە لە خۆبڕین. واق وڕماو شاش. ــ کردن: تاساندن. بێ تروسکە. دیینج، کش ومات، کژومات، بێدەنگ، دژ، دز، گڕ، داکەوتن، ووست، کپ، بێ دەنگ. قوولکەی مەڕمەڕینییە و ما تێنی تێدا دەکەن. (ڕۆژ. ، کە. ) تکە.

**ماتە** (کە. ، کۆ. ، ڕەوا. ): بە نزیک گەیشتنی میوە و تەڕەکاری دەڵێن (میوەی فەریک) . ــ بووە: فەریک بووە. بەردی جەهەننەم. برژاندنەوە.

**ماتەمات:** بە ــ : بە هێواشی، بێ دەنگ.

**ماتۆرە** (باک. ): بێ میقدار، پەست، نزم، بێ نرخ.

**ماتێن:** مەڕمەڕێن، (کۆ. ) مووشانە، (هەو. ) ماتانێ، (شا. ) میتینی، (بابا. ) مووشێنی.

**ماتی:** کڕایی، بێ دەنگی، کاسی، بێ هۆشی، ئاسایی.

**ماتیین:** جوورە تفەنگێکە.

**ماچ:** ڕامووس، مۆچ، مووچ، ماچک، (باک. ) ماچۆ. ــ کردن: ڕامووسیین، ڕامووسان، ڕامیسیین، ڕامووساندن.

**ماچان** (هەورا. ): مەواچان، دەڵێن، دەبێژن.

**ماچە** (کە. ): ئێستریی مێ. (فە. ) جوانوو.

**ماچەنکێ** (کۆ. ): جوورە قومارێکی جگێنییە بە پتە لێ دەدرێ. (موک. ) مەحانچێن.

**ماچک** (باک.): ماچ.

**ماچۆ** (ژا.، شەبە.، هەورا.): دەڵێ، (باک.) ماچ.

**ماچوموورچ**: دووکەس هەر یەکتری ماچ بکەن.

**ماچی** (هەورا.): دەڵێ.

**ماچیچکۆک** (بار.): سێچکە.

**مارخ** (باک.): فاسیلەیەکی جوێ کەرەوەی تیپرانە یەک لە یەکی.

**ماخەر** (ڕۆژ.): ماکەر.

**ماخۆ** (ڕۆژ.): خاوەند، خێویی، ماڵخۆ.

**ماخۆلیا**: ماخولیا، سەوداسەر، گراو، دڵدار، دێوانە، حەبداڵ، گێژ، خەمخوار، خەمخۆر.

**ماخوولیا**: ماخۆلیا، ـــ یی: دێوانەیی، گراویی، دڵداری، خەمخواریی، خەمخۆری، گێژی.

**ماخوولیا**: ماخۆلیا، ـــ یی: دێوانەیی، گراویی، دڵداری، خەمخواریی، خەمخۆری، گێژی.

**ماد** (باک.): ڕەنگ، چارە (چهرە)، میزاج، مادیّ وی چوویە: ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاوە، ڕق. ـــ کردن: ڕق هەستان. مادیّ من ژیّ مایە: لێی دڵگیر بوومە. کورد.

**مادا**: کورد.

**مادام**: جوورە پارچەیەکی لۆکەیی و ڕەشە.

**مادانگ**: قەلادە.

**مادانی** (باک.): جوورە بوزوێکە.

**مادە**: شت. (بابا.، هەو.، هەورا.): دۆشەگەڵەی نانییە. (دەر.، هەورا.) کولێرە تەنک و ناسک و گەورە و خڕە کە بە تەندووری برژابێ. (خۆ.) هەورامانی، (دەر.) نانەشینە. برین پێچان.

**مادەک** (باک.): گامێش.

**مادەکریی** (باک.): بەدخوو.

**مادخوەز** (باک.): شاد، پەسند. مادخووز کراو: پەسندکراو.

**مار**: ئەژی. ماریّ کەرانە. (باک.) جوورە ناسکێکە. ـــ گەزتوو: مارانگاز.

**مارۆژۆک**: مارێژۆک. گیاییکە لە هەوەڵی شەوێدا تا بەیانی بستێک بڵند دەبیّ کە ڕۆژی لێدا پیر دەبیّ. ئەو گیایە لەکاتی بارانەدا دەبیّ، بە هێلکەوڕۆنەوە سوور دەکرێتەوە.

**ماران**: سەرداو، جێگایەکی ساردە بۆ تێدا ڕا گرتنی شەراب و زەخیرە.

مارانە

**مارانە** (فە.): مۆرانە.

**مارانگاز**: مارگەزتوو، گەزتە. مارانگەزتوو. چارەی لە کوردستاندا ئەوانەن: ١) ترياک. دەڵێن: کەمێک جێگایەکەی بکڕێنریّ و ترياکی لەسەر دانریّ بەڵاّن ترياکەکە تەڕ بکریّ ئەوسا دانرێت. زۆر تاقی کراوەتەوە بۆ دووپشکیش زۆر باشە. ٢) ئاور. دەڵێن: جێگایەکەی کەمێک دەکڕێنریّ پۆلووی ئاوری لەسەر دادەنریّ ئەوسا کەمکەمە ئاوسارییەکەی دێتە خوارەوە تا تەواو دەنیشێتەوە. بۆ دووپشک زۆرتر تاقی کراوەتەوە. ٣) پووشووی نێوداری. دەڵێن: ئەو پووشووەی کە دەیکوشن وێک دێتەوەو کە بەر دەدریّ زل دەبێتەوە بە ئاور بکریّ و لەسەر جێگای مار پێوەدراوی دانریّ تا هەمووی دەسووتیّ ژەهرەکەی تەواو کۆ دەکاتەوە و دەیکاتە پلۆق و دەردەبیّ و کابرا لە مردن ڕزگار دەبیّ. ٤) پەڕی تاوسی. دەڵێن: کچە ئینگلیزێک لە هیندستان مار پێیەوە دەدا گەلێکی لەسەر کۆببوونەوە نەیاندەزانی چی لیّ بکەن کەچی هیندییێکی پیر ڕادەبرد کە وای دیت دەست بەجیّ سەبیلەیەکی پڕ کرد لە پەڕی تاوسی و کێشای و دووکەڵەکەی لەدەم و لووتی کچەکەی دەکرد. کچەکە چاوی هەڵێناو کەمێک وە هۆش هاتەوە ئەوجا سبیلەکەی لە دەمی کچەکە ناو پێی کوت بکێشە کە کچەکە چەند نەفسێکی لێدا تەواو چاک بۆوە. ٥) سیریی تەڕ یا ووشک. دەڵێن: جێگایەکەی کەمێک دەکڕێنریّ و سیری بە کوتراوی لەسەر دادەنریّ و دەبەستریّ. ٦) گۆرمزە. دەڵێن: هەر چەندی کە ئەستوور بوویێ، گەڵاو لاسکی گۆرمزە بە کوتراوی لەسەری دادەنریّ بە شەو و ڕۆژێک چاکی دەکاتەوە. ٧) نۆشادر. دەڵێن: نیو میسقاڵ نۆشادر لە ئاوێدا بخوا و هێندێکیش لە جیّ دەمی ماری بدات مارانگەزتوو چاک دەبێتەوە. ٨) بۆنخۆشکە. دەڵێن: گیایەکە لە زیخمالاّن دەبیّ بۆ مارو دووپشک و کەچەڵی زۆر باشە. بە تەڕیی دیارە بەڵاّن بە ووشکی کەمێک تەڕ دەکرێت لەسەر جێگا گەزراوەکەی دادەنرێت کە کڕێنرابیّ. بۆ برینێکی کە حەرارەتی زۆر بیّ لەنێو ئاوێدا زۆر دەکوڵێنریّ و تێیی دەدرێت. ٩) گیامار: دەڵێن و دیتوومە: پەنجە گیایەکە تا دووبست ونیوبڵند دەبیّ و لە بنەوە چەند لقێکی باریک هەڵدەچیّ و لە بنەوە تا سەری بە بڵاوی بەقەدەر پانی قامکێکی دوو جووتە گەڵایەکی بەرامبەر یەکتری دەر دەکات لەلای سەرەوەش هەر گەڵایەکی کارتەیەکی چکۆڵە دەردەکات کە هەریەکەی ٣ ـــ ٤ گەڵای چکۆڵەی پێوە دەبیّ. گیامار بۆنی خۆشە بەڵاّن زۆر تاڵە. گەڵایەکانی وە ئی ڕێحانەی کێویی و سپی دەچیّ. گوڵی گیاماری لەلای سەرلکەکانەوە هێندەی بستێکی گوڵی سوور یا سپی یا شین دێنیّ، شکڵی گوڵەکانی وە گوڵی گیا چاومژمژەی دەچیّ. بنەکەی لەزەویدا بە قەد قامکێکی ئەستوورە بە ڕیشەی ووردو زۆر داپۆشراوە. ئەو گیایە بۆ مارو دووپشک جێگایەکەی دەکڕێنریّ و لەگەڵ ماستی بە تێکەڵاوی لەسەری دادەنریّ و دەبەستریّ و دەست بەجیّ چای گیاماری چەند ئیستیکانێکی دەدرێتیّ. زووی چاک دەکاتەوە.

**مارانگەزتە**: مارگەزتوو، ڕۆژگار دیتوو، تاڵاوی ڕۆژگار چەشتوو.

**مارانی** (دزە.): چتێکە خڕ بهۆنرێتەوە.

**مارە**: مەهر. ـــ کردن: ژن مارەکردن. ـــ بڕین: مارەبڕین.

**مارە**: ڕاوکە.

**مارەزا**: مارزا، هەوەڵ پیسایی کار و گوێلکانە.

**مارەخۆرە** (کە.): قۆڕیی. دوولقەدەر. وڕل.

**مارەزیچکانیّ**: (هەو.) گەمەیەکە ١٤ قۆرتان لیّ دەدەن.

**مارەزیبو**: هەزار پیّ.

**مارەکە** (باک.): زیین.

**مارەکوڵ** (هەورا.): دووپشک.

**مارەیی**: هەشتیەک، هەشتەک. ـــ لێک هاتن: پیّ شان، ـــ لێک نەهاتن: پیّ نەشان.

**مارپێچ**: (هەورا.) میزەگا، (دەر.) گامیزە. جوورە دڕوویێکە. چەشنە پێچێکە. ـــ ی جگەر: جەرگ مارپێچی.

**ماردەم** (کەل.): جوورە تفەنگێکە.

**ماردەی** (هەورا.): شکاندن.

**مارز** (موک.): نەفرەت لێکراو.*

**مارزا:** مارەزا.

**مارس:** جنێوێکە بە پیاو ترێنان دەوترێت.

**مارزۆ** (زەن.): هێشتن، لێگەڕان.

**مارستان:** نەخۆشخانە.

**مارگەزتوو:** مارگەزتە، ئەوەی ماری پێوەدابێ.

**مارگیبر** (باک.): مارگل.

**مارگل** (باک.): باڵندەیەکە، مارگیبر.

**مارگیبسک** (باک.): جوورە مارێکە.

**مارمارۆک** (باک.): سووسەمار.

**مارماسی:** جەڕی.

**مارماریشۆک** (باک.): مارمارۆک، سووسەمار.

**مارمارێ** (هەو.): گەمەیەکی منداڵانەیە.

**مارمەزوولکە** (کف.): مارمێلکە.

مارمەزوولکە

**مارمژ** (باک.): زەروو.

**مارمێلکە:** (کف.) مارمەزوولکە، مارمیلۆک، ــــ ی گەورە: داڵکەمارانە.

**مارمێلۆک:** مارمێلکە.

**مارنەگەز** (هەورا.): چکمە، جزمە.

**مارۆ** (بابا.): بەش، قەشان، ڕەشەوولاخ، ئەسپ یان ماین کە نێوچاوانی سپی بێت.

**مارێژۆک:** ماراژۆک.

**ماری** (باک.): مێیینەی چەند جوورە باڵندەیەکیە.

**ماری ئاوی:** ماری ئاوێ.

**ماری تاڵێتۆزی** (موک.): جوورە مارێکە، ماری تاڵنتۆزی.

**ماری ڕەش:** جوورە مارێکە.

**مارییژە:** گیایەکە هێندەی بەژنێکی بڵندو گەڵای وەکوو ئی مێوێ دێنی بە کولاوی بە خوێوە دەخورێ لەنێو شیرێژیشی دەکەن.

**ماری کتکی:** قووڵە وەیباب.

**مازگ** (فە.): نێوەڕاستی پشت.

**مازبڕ:** نەخۆشی مەڕانە.

**مازماز** (باک.): خەرت، بەرانی دووساڵانەیە. ــــ خەساندی (باک.): بەرانی دووساڵانەی خەساوە. خەرتی خەساو.

**مازڵۆخ** (هەورا.): بەرماڵ.

**مازۆرێ:** تۆراوێکە جێگای خۆی بە جێ بێڵێ و بچێتە لایێکی دی.

**مازوو:** (باک.، کۆ.) مازی، مازوج. ــــ کردن: مازی چنین.

**مازووڤان** (باک.): خانەخوێ، مێواندار.

**مازیی** (کۆ.): مازوو، (هەورا.) پشت.

**مازیی پشتی:** گرێی پشتی.

**ماس** (هەورا.): سەوداسەر، گراو. ماست.

**ماسان:** ئەستووربوون.

**ماساوگێر** (هەورا.): ماسیگرە.

**ماساوی** (هەورا.): ماسی.

**ماسە** (باک.): مێز. کتلە، لم.

**ماسبزان:** لەپێش ئیسلامییەتدا شارێکی گەورە و کۆنی پێشکۆهی لوڕستانێ بووە لەناحیەی ترهان لەلای ڕاستی خەتی سیمرە.

**ماست:** (باک.) ترۆلە. مێست.

**ماستاو:** ــــ کردن: ڕیایی کردن، دەڵەچەکی، مەڵەچەک، (هەورا.) ماستاوە، شیناو، ماستەوا، چەقڵەماست. چەقڵ ماست. ــــ سارد کردنەوە: ڕیایی کردن، کلکەسوورە، ڕواڵەت، خوەلێدانین.

**ماستەک** (باک.): ڕەحەتی.

**ماستەوا** (باک.): ماستاو.

**ماسک** (بابا.): مەیتەر، بەرچاوتەنگ. (کەڵ.) ئاسکی مێ.

**ماسکە:** مەسخەرە.

**ماسکێش:** گەواد.

**ماسۆلە** (بانە.): جوورە برنجێکە لەنێوانی سەدری و گردەبیدایە.

**ماسوور** (باک.): قەفی قامیشییە. زاویەدار، گۆشەدار.

**ماسوولە** (بلۆ.): جێگایەکی کەمێک ئەستووربێ وەکوو ماسی لە لەشی مرۆ، ماسولکە، تیسمالکی گۆشتی لەشییە. ــــ کوێرە: ڕیخەڵۆکە کوێرە، ماسولکەکوێرە.

**ماسوولکە:** مالۆسکە، ڕەوسە، ئەو کۆما گەنمە درێژانەیە لەکاتی بە با کردنیدا لە کای جووێ دەبێتەوە. (هەورا.) وولەمە. ماسولە، ئەو گۆشتە نەرمانەیە کە بە قوڵ و پۆز و ڕانەوەیە. ــــ دەزوودارەکان: ماسولکەی باریک و داوداوە.

**ماسوولکە کوێرە:** ماسولکەکوێرە، ڕیخۆڵەکوێرە.

**ماسی:** ــــ بە خێوکردن: (باک.) داسی. (هەورا.) ماساویی. ــــ گرتن، ــــ بە دەرکدارەکان. (باک.) ــــ بەمرات. ــــ ڕەشک. ــــ بزریی. ــــ زەرد، ماسییە زەردە. ــــ جەور. ــــ چەلەکی. ــــ مرتالەک. ــــ فلەهی. ــــ کوولووچمار. ــــ پۆلا. ــــ ڕجووک. ــــ سەرنگ. ــــ شەبۆت. ــــ تەرییی. ــــ سەرک. ــــ سەرگۆلک. ــــ سمبێلک. ــــ شەلق.

**ماسیان:** هەڵامسان، بەستن، بەستەڵەک.

**ماسیاوزەن:** ڕەق هەڵاتوو لەبەر ساردی، بەستراو.

**ماسییەپانکە:** جوورە ماسییەکی پانە. ــــ زەردە: ماسییێ زەرە، جوورە ماسییەکی زەردە، زەردەماسی. ــــ گووڵە (موک.): جوورە ماسییەکە.

**ماسییەوان:** ڕاوکەری ماسییان، (باک.) ماسییڤان. ــــ ی: کاری ماسی گرتن.

**ماسییرە** (فە.): سستەر.

**ماسییڤان** (باک.): ماسییەوان، ڕاوکەری ماسییان.

**ماسوگیر** (هەورا.): قاق.

ماسیگرە

**ماسیگرە:** باڵندەیەکی سپییە گۆشتی دەخورێ.

**ماسیگرەک:** (ئەردە.) زیقاوڵە. (بادە.) تەستەزیینک. قاق.

**ماش:** ـ کردن: مانەوەی ئاو. ـ و برنج: تەنیا بۆ ڕیشی بەکاردەبرێ کە ڕەش و سپی تێکەڵاو بووبێ.

**ماشاندن** (موک.): تواندنەوە، کرۆشتن (بماشیینە).

**ماشە** (موک.): مقاش، پەنگرگر، پەلگرک، (باک.) پەلگر، (خۆ.) پەنگرکێش، مەقەش، کلاڤە، گاسک، (باد.) گازک، (باد.) بڤە، سیپەلان: لەنێو یا لە کەنار چۆماندا بە تانۆک و ئیدیی چتێکی دروست دەکەن ماسی دەچێتە نێو و دەیگرن. بە ـ گرتن: چمک دان. ـ ی تفەنگێ: مەقەنەزمە. ـ ی ئاوریشمی: چەکە.

**ماشەر:** کلاڤە بەنێکە لەنێوان دوو ئەژنۆدا هەڵ دەکرێتەوە. ـ ی بەنی. (شار.) تاقمی جۆلایی.

**ماشەرە** (کۆ.): گیا مامزە وەکوو کەر خنکێنە وایە.

**ماشتە** (کەل.، زەن.): کۆلوانە.

**ماشتن:** ماڵین. (هەورا.) مالای.

**ماشران:** گەسک دران، ماڵران.

**ماشک** (باک.): گیایەکە.

**ماشۆت** (باک.): کرمی دارێ.

**ماشێن:** مەکینە، سەیارە. ـ ی دروومانی: ماکینەی جل دروون. ـ ی ڕێگای ئاسن: قیتار، شەمەندەفەر.

**ماشین:** ماڵین.

ماشیینگ

**ماشینە:** شۆرباوی ماش. مەکینە، چەرخ.

**ماشینەوە:** ماشین و ڕادانی هەموو شتێک.

**ماشیینگ** (باک.، باد.): باشوکە.

**ماف:** حەق. بافت. (خۆ.) گە. ـ ی پاشە ڕۆژدانان: مافی بڕیاری چارەنوس.

**مافەتە** (هەورا.): کرمێکە لەنێو گیایدایە چقڵی گیای بە لەشییەوە نووساوە ئاژاڵ کە بیخوا پێی دەمرێ. دەردێکی ئاژالان و مرۆیانە. خۆرە. گیایەکە مالات بیخوا پێی دەمرێ. (پژ.) ڕێنج، (گەورگ و مەنگوڕ) گیابڕ. لە لای مەردوخی سورقە کرمێکی گچکەیە لەنێو کاو کۆلیدایە مەڕ بیخوا پێی دەمرێ.

**مافر** (باک.): چونکوو، وەکوو.

**مافوورە:** فەرشێکە لە خوریی بەرز دروست دەکرێ، خاڵی، خالی، قالی، بکۆ، بسکۆ، (باک.) لۆپ. ـ ساز: مەفوورکار.

**ماقووڵ:** بەڕێز، سەنگین، بەڕوو، سەنگین وگران. ـ ی: بەڕێزی، سەنگینی.

**ماک** (کە.): هێلکەی گونییە. (فە.) تفنگ، کونە لووت. گلێکە هەرێتی دژشاوییە. مەستی و سەرخۆشی. بنچینە. میکرۆب. بنچینەی برینان. ـ ی خەویرکە: (باک.) پارزا. کوتان. پارزادان. ـ ی لێ پیس کردن: تەشەنە کردن. (باک.) دایک، دایکی بێچووە بەرخ وکارییە. مێ. مێیینە. (هەورا.) خاڵی گەورە و پەڵەی گەورە. پارچە خاکێک و ئیدی. (باد.) دایک. زمانی دایک. لە زاراوەی کۆنیشدا بەکار براوە وەکوو دوژمنێک گازی دوژمنی خۆی کرد گوتی: هەی ئەسپێ من ئد ژن ماکێ تە گای: وای هەسپێ من ژن و دایکی تۆی گابێ.

**ماکاش** (باک.): خێڵ.

**ماکاو** (کە.): ماکاوی برنجی. زەوی مەرەزە کردنە چەند بەشێک بۆ ئاودان.

**ماکەر:** ماخەر. کەری مێ. مۆکەر.

**ماکەو** (هەورا.): چیپڵی.

**ماکەدەر** (سوو.): مەسدەر.

**ماکێش** (باک.): پلاوپارزن، قاپێکی کون کونە بۆ چت پالاوتن.

**ماکینە:** ماشینە، چەرخ.

**ماگە:** ماوە.

**ماڵ:** موڵک، کردنە ـ: ساخ کردنەوە، ماف سوورکردنەوە. ئەوەیە کە مرۆ هەیبێ، دەست پێ دامالین، هەورێ، پارەیەکە لە بری زێڕو زیو و جل و بەرگ یا لە جیاتی خوێن بدرێ بە ماڵی بووکی. ژنی خاوەن ماڵ، خانوو، خانەوادە، منداڵ، (باک.) پەرگال. (هەورا.) یانە، (لو.) خانە، دێلییز، خوەمالی، خوەدیتی، سامان، بڕوانە: مالات، ماڵدار، ماڵداری، بێ ـ: (باک.) بێ دارمال، هەژار. بە ـ: دەوڵەمەند، خاوەند ـ. ـ کردن: ماڵ و ناوماڵ پێکەوە نان. جوێ بوونەوە، ماڵێک بکرێتە دوو یا چەند پارچەیەک. زێی وولاخ و ئاژالانە. ـ اتە ئاڤا: مەمنوون، ماڵت ئاوەدان. ـ ا خودێ: مزگەوت، ماڵی خوا. زەکات.

**مالات:** ماڵیات، وەڵس، (کە.) وولس، دەوڵەت، بزن و مەڕ و ڕەشەوولاخ، ئاژاڵ، (باد.، هەورا.) ئاژەڵ (یی وورد). گاو مانگاو ئیدیی، ڕەشەوولاخ، چاورا، وولاخ.

**مالاڤا** (باد.): ماڵیاوا، بمێنی بەخێر. ـ یی: مالاوایی.

**مالان:** مالانن، ماڵین.

**مالاو** (ڕۆژ.): مەڵە.

**مالاوا:** ماڵیاوا، بەدوعا، سوپاس. ـ یی: شوکر، مالاڤایی، ماڵیاوایی، سوپاس کردن، سوپاس.

**مالای** (هەورا.): ماڵین، ماڵشتن.

**ماڵە:** (هەو.) ماڵنج، مۆڵە، هەرییی. ـ کردن: مۆڵەکردن. (کە.) ماڵووی جووتی. دەردێکە لە دەم و چاو یا لە گەرووی ژنی ئاوس دێ.

**ماڵەر:** گەسک لێدەر، ماڵشتە.

**ماڵەوماڵ:** گەڕان بە مالاندا.

**ماڵبات** (باک.): بنەماڵە.

**ماڵبەنان** (ڕۆژ.): مەڵبەند، قۆناخ.

**ماڵبەند:** مەڵبەن.

**ماڵبڕین:** دزی لێ کردن بە بڕینی دیواری خانوو و چوونە ژوورەوە.

**ماڵپشکنین:** کۆڵینەوەی ماڵ بۆ گەڕان بە دوای شتێکدا. *

**ماڵچە هنوو** (باک.): جوانووی مێ.

**ماڵخۆ:** خاوەند، (باک.) ماڵخوێ، خاوەن، ماخۆ.

**ماڵخوێ** (باک.): خاوەند، خیوی.

**ماڵخی ماڵ:** خاوەند ماڵ، خیویی.

**ماڵخیر** (باک.): جوورە تفەنگێکە.

**ماڵ کاوڵ:** ماڵ وێران، ماڵ کەمباخ.

**مالدار:** دەولەمەند.

**مالدەر:** دەست بلاو، چاوتێر، دلفراوان، بەخششکار.*

**مالران:** گەسک دران، دامالان، دامالران.

**مالداریی:** ئابووریی، وەرام، پاشەکەوت، دەولەمەندیی، گردوواری، گردوکۆ.

**مالزاروک** (باک.): یزدان، تۆلدان.

**مالسته** (باک.): رەنگکەر، رەنگین.

**مالستن** (باک.): رەنگ کردن. نەخش کردن.

**مالشت:** شێلان.

**مالشته** (لو.): گەسک لێدەر (کەنناس).

**مالشتن:** گەسک لێدان. (بمالە).

**مالک** (باک.): خانووچکە، خانووی چکۆلە، کولێت. کالان. مال و سامانێکی کەم.

**مال رێک خستن:** دانانی کەل و پەلی ناومال بە رێک و پێکی.

**مالکەک:** لە باسی هەلبەستاندا بەکاردەبرێ، بڕوانە فەرهەنگی کوردی و فەرەنسی.

**مالکەیی:** موفلیس.

**مالم:** پیاوی ئایینی جوولەکان.

**مال مالانێ** (هەو.): گەمەیەکی مندالانەیە.

**مالمالوک** (باک.): جوورە هەلپەرکێیەکی کوردییە.

**مال گرتن:** پارە پاشەکەوت کردن.

**مال گر:** ئەوەی پارە پاشەکەوت بکات و خەرجی نەکات.

**مالمیڤان** (باک.): ئوتێل، میوانخانە.

**مالنج** (خۆ.، سۆ.، دزە.): مالە. ــ کردن: مالەکردن.

**مالوەدەر** (هەو.): کاتێکە لە بەهاراندا کە دێهاتییان مالان بەجێ دێلن.

**مالوچە:** مالویچە، گیایەکە گەلای درێژە وەکوو لاولاو وایە.

**مالوچکە:** مالی بچووک.

**مالوس:** بەرازیی مێ.

**مالوسکە** (کۆ.): ئەوکۆمای دەغلە درێژانەیە کە لە دەمی بە با کردنیدا لە کا جوێ دەبێتەوە.

**مالوو:** (باد.) تەپان، (هەو.) رەوسە، مالنج. شڤنە، شنگیینی، مالە، مالگیپر.

**مالووسکە:** جێگای دار و قامچی هەلاییسان.

**مالوێران:** مال کاول، مال کەمباخ، لێ قەوماو و چارەرەش، هەی ــ خۆم: هەی لێ قەوماو و مالکاول خۆم.

**مالوێچە** (رۆژ.): مالوچە، گیایەکە بۆ زگ چوواندن زۆر باشە. لاولاوەی کێوییە.

**مالوێنچە** (بابا.): مالوێچە، گیایەکی رەوانە.

**مال ومنال:** خاوخێزان.

**مالهات** (باک.): خانەدان، خانەوادەی نەجیب و شەریف. (باک.) ــ ی: خانەدانی.

**مالی:** کەریی، متۆ، متوو، خانەکی، لیینی.

**مالیات:** باج سەندن.

**مالیوا:** مالاوا، پنیوس، ئەو دەمەی لای ئێوەمان خۆش. ووشەیەکە لەکاتی بەجێ هێشتنی کەسێکی یا چەند کەسێکیدا بەکاردەبرێ. (هەورا.) خوواچەنی. مەمنوون، سوپاست دەکەم. ــ یی: مالاوا. سوپاس.

**مالیان** (لو.): مالیهات.

**مالیسوک:** چلە گیایەکە نیوگەز بلند دەبێ پەلکی وە ئی ترشۆکەی باش دەچێ بەرەکەی سوورە وەکوو دەنکی سماقییە و ناخورێ.

**مالیین:** سوونەوە، ماشتن، دامالین، (لور.) مالیان، (هەورا.) مالای، گەسک لێدان، دەست پێداهێنان.

**مالیینەوە:** کۆکردنەوە سەر یەک.

**مام:** برای باوک، (باک.) ئاپ، (باک.) هاپۆ، ئاپۆ، (رۆژ.) مامک، مامۆ، ماتک، (فە.) ئام.

**ماما** (کە.، هەورا.): نەنک، داپیرە.

**مامالە** (هەورا.): جالجالووکە. خالخالۆکە. پیرێژنێکی پیرو وێکهاتووە.

**مامالی** (هەورا.): مامالە.

**مامان:** (باک.) پەزاج، مامەچەر، ئەو ژنەی یارمەتی مندال بوونی ژنان دەدا، (لو.) مامو. ــ ی: پەزاجی.

**مامە:** لەکاتی بانگ کردنی مامدا بەکاردێ، مامۆ، (هەورا.) نەنک، داپیرە.

**مامەحووجێ** (کۆ.): بابۆلەی نانی.

**مامەش:** عەشیرەتێکی کوردە.

**مامەند:** نێوی پیاوانە.

**مام برایمە** (موک.): ترێی دۆشاوی، جوورە ترێیەکە.

**مام جیژنۆکە** (بابا.): (موک.) پالقوزە.

**مامچە** (فە.): مامەچە، مامان.

**مام دەرزیلە** (خۆ.): دەرزییلە (گیایەکە).

**مامر** (دەر.، کە.): مریشک.

**مامرەچیینی** (کە.): مریشکەچیینی.

**مامرەرەش** (رۆژ.): بالندەیەکی رەشی ئاوییە وە مراوی دەچی.

**مامرغ** (باک.): بالندەی چکۆلە.

**مام رێواس:** گیایەکی کێوییە وە ئانی حاجی لەگلەگی دەچی بەلان گەلای لە نیی وی پانترە کەسێکی کرمداریێ بە کالی یا کولیوی یا بە چێشت بیخوا زۆر بە سوودە، (باد.) تۆلەترش.

**مامز:** ئاسک. نێوی ئافرەتیە.

**مامزە:** مەموز. ئاسنێکە پوولەکەیەکی پێوەیە لە پشتی پانیەی چەکمان دەدرێ تا زرییگەی لێ بێ و وولاخیشی پێ لێ دەخورێ و لەپێشدا پالەوانان بە کاریان دەبرد.

**مامش:** کپ، بێ دەنگ.

**مام شەبەقە:** ددانەمشکە.

**مامک** (باک.): مەتەڵە، تشتەنۆک. (ڕۆژ.) مام.

**مام کوڕ:** تیرەیەکە لە بادینان.

**مامگ** (شو.): مام.

**مام میرانی:** گیایەکە بنەکەی دەکوترێ و بە ووردی وەک تۆز دەخورێ بۆ زگ ئێشەو مایەسیری زۆر باشە.

**مام نەبیلە** (خۆ.): گیایەکە وەلاولاوی دەچی.

**مامۆ** (هەورا.): مام، مامە.

**مامووتە:** شیرەی خۆزییلک.

**مامۆتک** (دەر.، برا.): زانا، (هەورا.) ژیبرلۆ، ژیبر.

**مامۆخ** (باک.): مامۆک، جوورە هەڵوجەیەکە.

**مامۆرە:** جوورە ترێزوێکە.

**مامۆزا** (باک.): ئامۆزا (بۆ کچ).

**مامۆزازا:** بن ئامۆزا.

**مامۆژن:** ئامۆژن.

**مامۆسا:** مامۆستا.

**مامۆستا:** زانا، زانەر، سەیدا، مامەوستە، مامۆسا.

**مامۆک** (باک.): جوورە هەڵوجەیەکە، (باک.) مامۆخ.

**مامەوستە** (باک.): مامۆستا.

**مامی خاڵۆس** (هەورا.): گەمەیەکە.

**مامییراب:** مامییرانی. زەردە چێوەیەکە گرە و پێوە دەنووسێ.

**مام میرانی:** مامییرانی، گیایەکی تاڵە بنەکەی بە ووشکی دەیکەنە تۆز و دەخورێ، بۆ زگ ئێشە و مایەسیری زۆر باشە.

**مامێتی:** مامییتی.

**مامییتی** (باک.): مامێتی.

**مامێز:** نەقیزە.

**مان:** ئاوازی چاوگ وەکوو: دورووماڵ. ڕاناوی لکاوی کەسی یەکەمی کۆ: دایکمان. ژیان، ماین (بمێنە)، مانەوە. جغنە، ڕق، هۆک، ورک، — گرتن: سل بوون، ڕک گرتن، زیزبوون. — گرتن (کەر و ووڵاخ): هەڵتیزان، هەڵتیسکان.

**مانا:** مەعنا. مانا لێدانەوە: ڕوون کردنەوەی واتا. — یی: مەعنەوی.

**مانەکی** (ڕۆژ.): ماندوێتی.

**مانەوە:** مان.

**مانتین** (باک.): جوورە پارچەیەکی ئاوریشمییە.

**مانەد:** دوارۆژ.

**ماندوو:** کەشەنگ، کەشەن، کفت، شق، خاوەفش، دەوخ، مانیا، شەقی، شەکەت، ماندیی. — بوون: قەرملیین، (هەو.) قەمیین، لەبکیین، چرووسانەوە، دەوخیین، جەڤلیین، ئەرخیین، بەتلیین، (باک.) هەفان، وەستان، وەستابوون، وەستیان. — کردن: (باک.) ئەرخاندن، بەتلاندن، دەوخاندن، هەفاندن، چەوساندنەوە، چرووسانەوە، لەبکاندن، قەرماندن، قەرملاندن، هەرشاندن. — نەبی: شەقێ تە.

**مانگ:** هەیڤ، هەیویی، هاییف، هەیوو، مانگی ئاسمان، مانگی سی ڕۆژ، (هەورا.) کاوت، مۆنگ، هەڤی، هەوی. — ی ڕۆژووان: ڕەمەزان، مەهـ، ٣٠ ڕۆژ: سەهووروک. گیرانی — : مانگ گیران. — هەڵاتن: دەرکەوتنی مانگ. دەردێکە تووشی منداڵان دەبێ. — ی یەک شەوە: هیلال.

**مانگا:** (هەورا.) چێڵ، مانگاوە، (باک.) چێلەک، (هەو.) چێر، (باڵ.) چیپۆک.

مانگا

**مانگاوشە:** گادۆشە، ئەو بادییە کە مانگای تێدا دەدۆشرێ.

**مانگار:** باقی.

**مانگاماسی:** جوورە ماسییەکە، (دەر.) باقۆ.

**مانگانە:** مەهک، مەهی.

**مانگاوێ** (هەورا.): مانگا.

**مانگەڕۆژ** (زەن.): مانگەشەو.

**مانگەشەو:** ڕووناکی مانگییە، هەویەشەو، هەویۆک، (باک.) تاڤهەی.

**مانگ ڕوو:** نێوی ئافرەتییە.

**مانگ وەرگرتن:** مانگ گیران.

**مان گرتن:** ئیزراب.

**مانگ گیران:** گیرانی مانگ. بزربوونی بەشێک یان سەراپای مانگ لەو کاتەی هەڵاتووە، لەبەر ئەوەی زەوی دەکەوێتە نێوان ڕۆژ و مانگ و لێ ناگەڕێ تیشکی ڕۆژ بە تەواوی بگاتە مانگ.

**مانگێر** (باک.): ماڵوو (ئی جووتی).

**مانگی:** ماندوو، مەهی. — تازە: هیلال، — ی چاردە: چاردەچەڤێ. — ی نوێ: هیلال، — ی یەکشەوە: هیلال، هەیڤا ئێک شەڤییە.

**مانن:** ماندووکردن.

**مانیا** (هەورا.): ماندوو.

**مانیاگ:** ماندوو، شەکەت.

**مانیای** (هەورا.): ماندووبوون.

**ماوەر** (هەو.): کویین، چەکووچی گەورەی بەرد شکاندنییە.

**ماوەی سڕبوون:** ماوەی مت بوون.

**ماوت:** پارچە، چوخ، جوورە پارچەیەکی خوورییە.

**ماوت ماڵ:** فرشە.

**ماودا:** ماوە، ماوا، نێوان، مەودا. — دان: مەیدان دان.

**ماولۆیی:** هۆزێکی کوردە کەوتوونەتە نێوانی گەردی و خۆشناوان.

**ماووزەڕ:** جوورە گۆرانییەکی کوردییە. ماویزەڕ، ماهووزەڕ.

**ماوزۆ:** بەجێ هێشتن.

**ماویی** (بار.): بەرازی مێ، مالۆس.

**ماوییزەڕ** (باک.): تفەنگی ماووزەڕ.

**ماه:** چیا، شاخ، کێو، شکێر، کێوێکە یەگجار سەخت و بڵندبێ.

**ماهەر** (شو.): ماکەر.

**ماهەشەل** (باک.): قایمەی مێوێ.

**ماهۆن** (باک.): ماهی. دەسکی چەقۆیە لە داری مێوێ دروست دەکرێ.

**ماهوو** (باک.): ڕاهب. کارەکەر.

**ماهی**: شاخێکە لووس و مەیلەو خوار بێت، بەدەسکی خەنجەرانیش دەڵێن کە سپی بێ، جوورە ئێسکێکە دەکرێتە دەسکی خەنجەران. ماهۆن.

**ماهییچ**: گۆشتە نەرمەی پێ.

**ماهی دەشت**: مەحالێکی گەورەیە لە خاکی ئەردەلاندایە چەندین هۆزی تێدایە.

**ماهی زەرد** (جا.): قوولایی قەدی شاخانە.

**ماهیینی** (زا.): ماین.

**مای** (هەورا.): هەڵدێر.

**مایان** (باک.): هەوییینی پەنیری.

**مایانۆک** (باک.): ئەوانەی کەدەڕوێن.

**مایە**: ماوە، سەرمایە، دەست مایە. ـــ ی کاروکاسبی، هیولی، مادە. ـــ ی نەخۆشی: جرثوم. دژز، هۆ. بە ـــ: ئەوەی مایەی هەبێ. بێ ـــ: مایەپووچ. (هەو.) ماوە. هوین، مایان، مایە بۆ پەنیری.

**مایەپووت**: نابووت، سەرسەری.

**مایەپووچ**: نابووت.

**مایەدار**: سەرمایەدار. ـــ ی: سەرمایەداری.

**مایەسییری** (هەو.): بیوەسییری.

**مایەمێو** (موک.): ترێیەکی سپییە دەنکی لە ئەی فەرخیی کورتترە. دەنکی هەیە.

**مایەندە** (باک.): ئیدی، هەتا هەتایە.

**ماین**: ماهین. مانەوە، مان.

**ماینە**: مێ.

**ماییچە** (کەل.): پارچە زێڕێکە لەنێوەڕاستی بەرموور و گەردنبەندیدا دەکرێ. (موک.) ئێستری مێ، ماچە، مەیە. نەرمەی پێ (گۆشت).

**ماین**: ماین، وولاخی بەرزە، ماهیین، (باد.) مەهیین. مان.

**ماین ماییناێ** (هەو.): گەمەیەکی منداڵانە.

**ماینە** (باک.): مێیینە.

**مە** (موک.): ئێمە، بەڵام بە تەنێ بەکار نابرێ، بە مەیان گوت: بە ئێمەیان گوت، دای بە مە: دای بە ئێمە. (زا.) ئێمە: پێشگری نەهێشتنە (مەخۆ).

**مەبادا**: نە وەکوو، نەکوو، نەک.

**مەبەس**: ئەچک، خەڵەسکوو، سەردڵ، گاڤین، مەبەست، نیشانە، ئامانج،مد ئارمانج، دڵخواز، مراز.

**مەبەست**: مەبەس.

**مەبۆ** (هەورا.، پاوە.، خا.، ژاوە.): دەبێ، ئەبێ (ئەمبۆ: نابێ). ـــ (هەورا. گەرمێنی): نابێ.

**مەبێ** (هەورا.): دەمەوێ.

**مەتارە**: مەتەرە.

**مەتەر** (زا.): مادە.

**مەتەرە** (باک.): مەتارە، توورەکەیە لە پارچە یا تەنەکە بۆ ئاوی بەکاردەبرێ.

**مەتاڵ**: قەڵخان، مەرتاڵ، مرتاڵ، (لو.) ئەسپەر، (موک.) پەنییرێکە لەنێو توورەکەیدا چۆڕابێتەوە و بوو بێتە سەلکێکی زۆر زل. ـــ گیر: مەرتاڵ گیر.

**مەتە**: کونکەر.

**مەتەرێز**: پشت بەرد یا دیوار و جێگایێکە شەڕی لێ بکرێ، دیواری شەڕی، سەنگەر، تابیە.

**مەتەفەرەنگی**: کونکەر، درێرک. *

**مەتەڵ**: مەتەڵۆک، مەتەڵە.

**مەتەڵە**: مەتەڵۆک، تشتانۆک، مامک، قروسەلە. ـــ داهێنان: دروست کردنی مەتەڵە.

**مەتەڵۆک**: مەتەڵە، تشتانۆک.

**مەتەوکەوانە**: ئاسنێکی لووت تیژە و بە زێی کەوانەیەک دەخولێنرێتەوە و داری پێ کون دەکرێ.

مەترەق

**مەترەباز** (باک.): چاپلووس، جامباز، ئەسپفرۆش.

**مەترەق** (کە.): کوتەک.

**مەترسی** (بابا.): ترس.

**مەتی** (هەورا.، سەق.): پاڵقۆزە.

**مەجرەفە** (باک.): سەتل.

**مەجرییکەنی** (هەورا.): دووارد، مقەست.

**مەجووسی**: مەجووس. ئاگر پەرست.

**مەجووجە** (باک.): غەمگین، بەدخوو.

**مەچ**: قەیدک، مەچی دەستی.

**مەچەک** (هەورا.): گە (مەچەکی دەستی، گەی دەستی)، بازندە، بوقی باسکی بازواندە، باق، زەند. فەرشک.

**مەچەکدان** (موک.): کوللە، پەردەی سەرتەختی نووستنێ.

**مەچییر** (مەر.، دەر.، شێخ.، فە.): دەزوو.

**مەچییرە** (کە.): سەرەتاو بەرایی قەوچەی ماکەو و ئیدیکە.

**مەحتەل**: گردەنشین، گیربوون، ڕاگیران، گیرۆ، پەک کەوتوو، دەستەپاچە. ـــ بوون: پەک کەوتن، بەندبوون. ـــ کردن: بەندکردن، پەک خستن، بەر هەڵست کردن.

**مەحچەچە** (هەو.): خرنووکی ووشک.

**مەحکەم**: ـــ کردن: ڤەبرین. نا ـــ: ناقایم، زوگووت، دەبان، (باک.) ڕەوال، قایم، توند، پتەو، ڤەبری، بەجەم، کرار، کەیار، پکێت، توێز. ـــ ی: توندیی، قایمی.

**مەحلان** (باک.): کارزان، قابیل. زانا، هونەرمەند، کارساز، شارەزا، (باک.) چستە.

**مەخەر** (باک.): ڕەچەڵەک، دەشت.

**مەختی** (باک.): بێستانی کاڵەک و شووتی.

**مەخەڵ** (باد.): مزڵگە.

**مەخز**: مەغز. مەخزی بادام.

**مەخسەرە**: دەردەسەری، چەرمەسەری، ئازار، ڕەنج. شەڕوکێشە، بەڵا، موسیبەت.

**مەخش:** مەشق.

مەخشەڵ

**مەخشەڵ:** مەشخەل، چراوگ.

**مەخلێلات** (باک.): ترێزوو.

**مەخمەر:** فرەز، (باک.) قووتوو، دۆڵچە، سەتل.

**مەخمەڵ** (باک.): خاوڵی.

**مەخمەلات** (باک.): شێلم.

**مەخمەلەک** (کر.): نەخۆشییێکی مندالانە.

**مەدبەند** (رەوا.): نێو لانکی منداڵان، ئەو کەل و پەلانەی نێو لانکییە.

**مەدرەخە** (باک.): ئەسپەرەی بێڵ و پێمەرەیە بۆ ئەوەی پێی پێ دانرێ.

**مەدفیینی:** (زاخ، بۆتا.) مەدوونی، (باک.) مەدفوونی، هەموو جوورە شۆرباوێکە، بە هی برنجی دەڵێن: شۆرباوی برنج.

**مەدوونە** (هەو.): قاپێکی گچکەی مس بووە رۆن گەرچک یا دۆنیان تێ دەکردو پلیتەیان تێدا دەناو سەری پلیتەکەیان ئاور پێوە دەنا لە جیاتی چرا، (شن.) نەستیوڵک.

**مەدۆنە** (کە.): پارچە ئاسن یا تەنەکەیەکە مزی تێدا دەتوێنرێتەوە.

**مەر** (هەورا.): مەگەر، (باک.) پێمەرە، خاکەنداز، ــ دان: خاوێن کردنەوە. (رۆژ.) مەی. ــ ی شاخدار: جەرنە، پەزی سپی، پەزی مێشینێ، شەکەمێیەکە گەیشتبێتە سێ سالان. بەردیلی سێ سالانە دەبێتە مەر، میهی، مەهی، مەهە، مەه، مێش. مێگەل، لەگەلدا بۆ نێر و مێ بەکاردەبرێ، ئی، هی، ئارزی، بەستە، لە مەرمنە: هی منە، لە ــ : ئارزیی، ئی، هی. (هەورا.) ئەشکەوت. هۆڵی مەرانە لە کێوان.

**مەراز:** مراز، ئامانج.

**مەرازە** (باک.): ساڵێکە لە تەمەنی سەگی، ئەڤە سێ مەرازە: ئەو سەگە سێ سالانیە. ئالووهاتن، بن شەویلکەکان ئەستوور دەبن و تف قووت نادرێ. مەرازە هاتن، مەرازە کەوتن.

مەراڤی

**مەراڤی** (باک.): مراوی.

**مەراق:** ئارەزوو.

**مەراقدار:** ئارەزوومەند.

**مەران** (باک.): یاسەوەنە، داروگوڵ.

**مەرانە:** کوودە، کۆدە. جوورە دارێکە.

**مەراندن** (باک.): جوولاندن، راوەشاندن (بەرێینە).

**مەرایی** (باک.): مەلەچەک، کلکەسووتە، ماستاوکردن، رووالەت، چاپلووسی، ــ کەر: ماستاوکەر.

**مەرە** (بابا.): حاڵەت، بار، مەرەد، دەرد، نەبوون، ئەوانەش بە ــ ی ئەوان بچن.

**مەرەد** (باک.): مەرە، پەنجەرەی چکۆلە، رەواق.

**مەرەز:** مەرز، تووکی بزنە مەرەزیییە کە هەموو رەنگێکی هەیە درێژەو نەرمە بۆ رانک و چۆغە دەست دەدا، بزنێکی هەموو رەنگیە تووکەکەی درێژو تیسکنە و نەرمەو بۆ رانک و چۆغە دەست دەدا، مەرز. کەژ.

**مەرەمووز:** پیاوی تەواو پوخت و کوڵاو وەکوو دەڵێن: هەتا بۆز نەبی مەرەموز نابێ، تا مرۆ سەرو ریشی بۆز و سپی نەبێ نابێتە پیاوێکی تەواو.

**مەرەزا** (فە.): مەرەمەر، باڵەی مەران.

**مەرەزە:** چەلتووکجار، جێگاو مەرزایەکە برنجی لێ چێنرابێ. برنج لەکاتی سەوزیدا.

مەرەکەب

**مەرەک** (باک.): ئەنباری گەنم.

**مەرەکەب:** حبر. ــ دان: دوێت.

مەرەکەمەرەک (کە.): پیلە.

**مەربەخ** (باک.): هەڵقەندن (بییرو هی تر). ــ کردن: هەڵکەندن.

**مەرەکیویی:** پەزی زۆزانان، پەزی سۆز.

**مەربەن** (کە.): گوریسێکی درێژە بۆ لەوەران لەدەستی وولاخی دەکەن و سەرێکی لە چتێکی قایم دەکەن، زنجیرێکە لە پێ و دەستێکی وولاخی دەخرێ یا لە دەستێکی دەخرێ و بە گولمێخی قایم دەکرێ. سندم، پێوەند.

**مەربەند** (شار.، باک.): سندم، پێوەند.

**مەرجاپیلک** (خۆ.): گیایەکە بەزەویدا پان دەبێتەوە و گوڵی زەردە بنەکەشی وە گێزەری دەچی و دەخورێ.

**مەرپێر** (باک.): پێمەرە، بێڵی ئاسن.

**مەرتاندن** (باک.): بەرتێنە، تووێژ یا پێست لێ کردنەوە.

**مەرتاڵ** (باک.): مەتاڵ.

**مەرتاڵ گێر** (باک.): مەتاڵ گێر، کەسێکە مەتاڵ بەکار بیات.

**مەرتیین** (باک.): بەرتە، تووێژ و پێست فرێدان.

**مەرج** (کە.، هەو.): گرێو، گرۆ، گرەو.

**مەرجان** (باک.): باڵندەیەکە. بستام. جوورە زیندەوارێکی دەریاییە وە گیا و داروباری دەچی و بە بنی دەریاوە نووساوە. لەپێشدا ئەویان بە گیایەکی دەریایی لە قەڵەم دەدا. هەندێکیان مەرجانی سوورە وەکوو گوڵ لەسەر لکی قسلاوییە لە گەوهەرسازیدا ئەوی بۆ رازاندنەوەی کەرستەی چتەکی نرخدار بەکار دەبەن. هێندێک مەرجان بە زۆری لەیەک شوێنیدا دەست دەکەون و سفن (مادە) ی قسلی لە دەورەی خۆی دەدەڵێنێ.

**مەرد:** پیاو، سەخی، ئازا.

**مەردال** (باک.): چڵکن.

**مەردان** (باک.): کوتک (چەکووچی دار).

**مەردانە** (باک.): سەخیانە، ئازایانە، پیاوانە. لوولە.

**مەردایەتی:** پیاوەتی، پیاوێتی.

**مەردوم:** مەرد، مرۆڤ، ئینسان، بەشەر، مەریتە.

**مەردەمێر** (باک.): جوامێر، پیاو. ــ ی: سەخاوەت، جوامێری.

**مەردەکار** (باک.): بەکار، کارکەر.

**مەردەوان** (باک.): پلیکانی قوڕ و خشت و ئیتر.

**مەردەی** (هەورا.): مرۆڤ.

**مەردیاق** (باک.): جوورە پردێکە لەداری باریک کاریتەو ئالودار. *

مەردیبیوان

**مەردیبیوان** (باک.): نەردیبیوان.

**مەرز** (باک.): مەرەز، (باد.) زەوی نەکێڵراو، قەڵس. ــ بوون: قەڵس بوون، هەرپەندمان. ــ کردن: هەرپەندماندن.

**مەرزاو:** کەناری ئاوی تەنک.

**مەرزەبان:** فەرمانداریکی کورد بووە لەپیشدا.

**مەرزم** (رۆژ.): پلووسک.

**مەرزنجۆش** (کۆ. ، ئالا.): گیایەکە تام و بۆنی وەچای دەچیّ کەمیّک بۆ خاوی لیّ دیّ.

**مەرزۆنە** (باک.): جوورە ترێیەکە.

**مەرزووب** (رۆژ.): پلووسک، مەرزم.

**مەرزیب** (فە.): پلووسک، سوولاوک.

**مەرزینجۆش** (کۆ. ، ئالا.): مەرزنجۆش.

**مەرس** (کە.): رقەدار. ـــ بوون: رق هەستان. لە قومارێدا دووجار ببریتەوە. شاشی نیّوانی خەتەکانی جووتییە. جووتیار کە جووتەکەی لە بەرد یا تەراش دەسووریتەوە.

**مەرسەف** (باک.): مجۆعمە.

**مەرشە** (بل.): دەمەقالە و لیّک توند بوون و بە گژ یەکتردا هاتن بە قسە.

**مەرف** (باک.): مرۆڤ.

**مەرفاتی** (باک.): خانەوادە.

**مەرقە** (باک.): پیواز لە روونیدا سوورکردنەوە.

**مەرکانە** (زرا.): مۆرانەی خووری.

**مەرکاندن** (باک.): خراپ کردن (بمەرکینە).

**مەرکووت** (باک.): کوتکی دار.

**مەرکیینی** (باک.): (بمەرکە)، توانین، خراپ بوون.

**مەرگ:** ئاکام، مرن، گل، مردن. ـــ ی من (بۆ سوێند دەبیّ).

**مەرگەمووش:** ژەهر.

**مەرگۆنە** (باک.): چت پیچانەوە و قەدکردن.

**مەرمەڕ:** بەردە مەرمەڕ، خارا، کەلا، هەڵمات، (زاخ.) تەبەل، گوللە (نی چکۆڵە)، (هەورا.) ببیل، کەللا، (هەو. ، خۆ.) کەلابەرد.

**مەرمەڕش:** بلووری، بەلووری، پیرانشای، بالبالی، بلووری، شاخ بزبی.

**مەرمەڕیی** (کە.): جوورە پارچەییّکی ژنانەیە، کالاّ.

**مەرمەڕیین** (هەورا.): گەمەیەکی منداڵانەیە بە مەرمەڕ، گوڵان، ماتین، هەڵماتین.

**مەرمووڵ** (باک.): برە، ددانە درێژەکانی بەرازیی.

**مەرمۆتک:** موهلە.

**مەرنای** (هەورا.): مراندن.

**مەرندای** (هەورا.): مراندن.

**مەرۆ کردن** (رەوا.): کۆکردنەوە.

**مەرواری:** مرواری.

**مەریاڵۆ** (هەورا.): شکان.

**مەرپایی** (هەورا.): شکاندن.

**مەرییتە:** مەخلووقات. مرۆڤ.

**مەرییکانە** (دەر.): مۆرانەی زل وەکوتی هەولیّرە.

**مەرییوان:** محاڵیّکی سەربەخۆیە لە باکووری هەورامانی ئیرانیدا لە مەر خاکی ئەردەلانە. نیّوی پیاوییە.

**مەز** (مام.): لەکن، لەلا. مەز پەزییە: لەکن پەزییە.

**مەزاختن** (باک.): خراپ کردن (بمەزخە).

**مەزاق:** قەشمەری، گەپ، تییز. ـــ پیّ کردن: قەشمەری پیّ کردن.

**مەزە چیژتن:** تام لیّ وەرگرتن، تامداری. تام، خۆش، خۆراکیّکە لەگەڵ خواردنەوەی مەی و ئارەقی دەخوریّت. بە ـــ : بەتام. بیّ ـــ : بیّ تام، تامسار، بارهنگڤ، رژیی، کەلە، بیّ مەزەیی: رژییتی.

**مەزەدار:** بەتام، خۆش، رازراڤ. ـــ ی: بەتامی، خۆشی، رازراڤی.

**مەزەلۆ** (باک.): چریشاویی. سمغدار.

**مەزخاندن** (باد.): چوواندن، گوزەراندن.

**مەزدەسینی:** زەردەشتی.

**مەزرا** (ع.): کیلگە.

**مەزراح** (هەو.): مەرزەق.

**مەزرە:** شبت. شیبووت.

**مەزرەق:** (هەورا.) گل گلوولە، (هەو.) مەزراح. غۆری.

**مەزرەقە** (لک.): کوللیّرە.

**مەزرەقیّن** (موک.): گەمەیەکە بە مەزرەقی دەکریّ.

**مەزرەکە** (باد. ، باک.): چاپخانە. رفیّن، (هەورا. ، بالەک.) دە.

**مەزرەکەوان:** چاپگەر، چاپگەری.

**مەزرۆنە** (باک.): جوورە ترێیەکە.

**مەزریی** (باک.): عیبرەت ئەنگیّز.

**مەزرینگان:** نیّوی ئافرەتانە.

**مەزغەنە** (باک.): خانوویێکە بە دییوادییو بە کریّ بدریّ.

**مەزلۆق** (باک.): داریّکە.

**مەزن:** سەرۆک، شان بڵند، جیّگەبەرز، بڵندجە، گەورە، زل، زەلام، براگەورە، ئاغا، سەرۆک. ـــ بوون: گەورەبوون.

**مەزناندن:** مەزن کردن.

**مەزناهی** (باک.): گەورەیی.

**مەزندە:** مامڵەت. نرخ، مز. ـــ کردن: نرخ کردن. تەخمین.

**مەزنی:** گەورەیی، پایەبەرزی، پایەبڵندی، بڵندجهی.

**مەزووک** (فە.): نەزۆک.

**مەژالک** (کە.): میّشک، جمجمەی سەری.

**مەژەند** (هەورا.): تیّوەژەنین، تیّوەژاندن، لیّدان.

**مەژگ** (کە. ، هەورا.): میّشک، موخ.

**مەژگە** (هەورا.): کاکڵە گوویّز و ئیتر.

**مەژیی** (باد. ، باک.): میّشک، کیسکا ـــ . قالکا ـــ : کەللەی سەری، کاژەڵەی سەر.

**مەس** (فە.): قەڵەو، گۆشتن. سەرخۆش.

**مەسسە** (کە. ، دزە.): (رۆژ.) بیّلەکان، پارچە ئاسنیّکی بەقەدەر لەپی دەستی جووتیّران گاسنی پیّ خاویّن و سندە گلاّتیشی پیّ دەشیّلن بە ئاسنەکەش هەر مەسسە دەڵیّن. (رۆژ.) گازران. ئاسنیّکە دییواری پیّ کون دەکەن. دییوارپر. داریّکە سەریّکی چتیّکی قورس و سەرەکەی

**هیوەرەزا:** کوڕی برای مێردی یە.

**هێوەرژن:** (هەو.) هەوگیان. ژن بۆ ژنی ژنی هێوەری دەبێتە ـــ. ژنی هیوەران دەبنە ـــی یەکتری.

**هێور** (باک.): لەسەرخۆ، ئارام بوونەوە دوای تووڕەبوون یا ماندووبوون.

**هێوران** (ڕەوا.): هێدی، هێواش، لەسەرەخۆ.

**هێوراندن** (باک.): دامەزراندن، کۆکردنەوە، جێ نشین بوون.

**هێورین** (باک.): دامەزران، کۆبوونەوە، بەهێورە.

**هێوڵ** (هەو.، دزە.): هێدی، ئارام.

**هێوڵی** (هەو.، دزە.): لە ڕێ و هەڵچوون ساردبوونەوە.

**هێوین:** هەرێن.

**هێوی** (باک.): هەویا، تەڕی. نێوی ئافرەتانە.

**هێ هێ** (دزە.، هەر.): بزنە گەلی پێ بانگ دەکرێ.

**هێ یەه** (ڕۆژ.): بۆ گلدانەوەی بزن و ئیتر.

**هێ ێ:** ئەرێ، هۆی.

**هی:** خوو، هیم، ئی. (باد.) فێر. ـــ کردن: فێرکردن. ـــ بوون: فێربوون.

**هێ:** ئی، هن. (باک.) ئارزی. لەمەڕ. (دەر.) هین. ـــ من: ئی من.

**هیت** (هەورا.): جووت، هیتە. ـــ کردن: جووت کردن. (باک.) قاپ، ئامان، لووس، ڕەمەکی، بێ نیشانە و لەکە.

**هیچ:** (باک.) چوو، توو. هەچی، تخ. (ڕەوا.) نەشتەبا. هیچ یەک، هیچ کام، ئاس و پەلاس. توو، پیچ. بە ـــ ی: بە خۆڕایی.

**هیچاک:** خووی چاک، هێمن، هیم چاک.

**هیچتا:** هێشتا.

**هیچ چنێک:** (ڕەوا.): نەشتەبا، هیچ کام، ئێک، هیچیان.

**هیچ کامیان:** ئیک، هیچ یەک. هیچیان.

**هیچکەس:** توو کەس.

**هیچکۆچی** (هەورا.): مێوژ.

**هیچ و پووت:** پەرچی، هەرچی و پەرچی.

**هیچ و پووچ:** سەرسەری، خوێڕی، پەست، بێ سەروبن، زیف، نەزان، کسەرباد، گێل، تووڕەهات. ـــ ی: نزمی، کەم، پەستی، ناتووڕەیی، پرووپووچ، ناتۆرە.

**هیچهار** (باک.): بیباری سوور.

**هیدمان:** سەرسووڕمان، واق وڕمان.

**هیر** (هەو.): زانا، ژیر، خانەدان، بەخت، هات. (باد.) فێر. ـــ بوون: فێربوون. بێ ـــ ی: بێچارەیی. بەخت ڕەش.

**هیرا** (باک.): ـــ بوون: هین بوون.

**هیربار** (هەو.): بە هەممو قاپ و مسان دەڵێن. (سور.) هیرماڵ، دەفر، ئاسنجاو.

**هیربزان:** چینی سێ یەمی میرەکانی ساسانیان بوون و دادوەری وڵات بوون. دادوەر.

**هیرتە** (هەو.، باڵک.): قایشێکە بۆسە و هیرتەی لێک دەبەستێ. (کە.) ویژە. (ڕۆژ.) نویژە، نیرتە، ویژە.

**هیردار:** ژیر، هۆشمەند.

**هیرێ:** دوێنێ.

**هیرک** (ڕۆژ.): دەستەبەرد. (دزە.) گاشە.

**هیرگا:** کۆلێژ، خوێندنی باڵا.

**هیرۆ** (باک.): هێرۆ.

**هیرین** (باک.): حیلاندن، حیلەی ولاخی یە.

**هیزا** (باک.): چارشێو. جوورە سەرپۆشێکی ڕەنگا و ڕەنگی ژنانە سوور یا زەرد یاشینە.

**هیزار** (هەو.): پۆشین. جوورە پارچەیەکی ڕەشی ئاوریشمی ژنانەیە لەسەری دەکەن. (باک.) مشار.

**هیزارچی** (باک.): دارتاش.

**هیزە:** پێستی مەڕ دوای چاک کردنی، بۆ هەڵگرتنی ڕۆن لە ناویدا. ـــ ی ڕۆن و دۆشاوی. (باک.) هیز، خیگە. (هەو.) دەخیل، ئامان.

**هیزەک** (باک.): دابەش کردن بەسەر چەند لکێک دا، لکە جۆگەی ئاوی.

**هیزرە:** ئەنباری دەخڵی.

**هیزکەردە** (زەن.): هەڵستان.

**هیس** (هەو.): قوورمی دیوار و میچانە، کە لە تۆزو دووکەڵی پەیدا دەبێ. دوودەی چرا، سناج.

**هیستۆک** (جز.، بۆتا.): ژێردەست.

**هیش** (باک.): قەراخ دەریا.

**هیشک:** وشک، ئیشک.

**هیشک ئاوز:** هیشکاوز، (دەر.) وشکەوەرد.

**هیشکۆلک** (باد.): تووی ووشک.

**هیڤارتن** (باک.): چنین، گۆرەوی چنین.

**هیڤە:** هەویا، نومێد، هیوا، (یەز.) هێڤی.

**هیڤەکێش:** نومێدەوار، هەویادار.

**هیڤی** (باک.): هێڤی.

**هیلم** (باک.): هەڵم، دراوسێتی، دەراوسێ یەتی.

**هیلین** (باد.): هێلانە.

**هیم** (جا.): خوو، ڕەوشت، ڕەفتار. پایە، تەختە، بەرد، تات.

**هیما** (هەورا.): هێشتا.

**هیمان** (فە.): هێشتا.

**هیمدا** (باک.): دامەزراو، بنکە.

**هیمی** (باک.): خراپ و گەنەبوون، بێکارە.

**هین:** ـــ کردن: فێرکردن. ـــ بوون: وشیاربوون. هەرامە. ـــ ی منە: هی منە، ماڵی منە. (دەر.) ئی وانێک، جایێ. کابرا، (باک.) هێشتا.

**هینا** (باک.): هین، فێربوون.

**هینان:** هێنان.

**هینەر:** فێرکار، مامۆستا.

**هینەک:** هێندێک، چەندێک.

**هینەهین:** هانەهان، هانکەهانک.

**هیندوویی** (بابا.): جوورە ترێ یەکە.

**هینک:** فێنک.

**هینگ** (شکا.): هەنگی ولاخان.

**هینگ و دەنگ** (باک.): شکۆ، پایەبەرز.

**هینی** (باد.): هەیتی.

**هینی مینی:** تیرەیەکە لە (لور.) شێوەی ناخۆتنیان زۆرسەختە.

**هیوا:** ئومێد، ئامانج، پوونگال، هەویا، ئارەزوو، تکا، هێڤی.

**هیوادار:** مەهدەرڤان.

**هیوابڕ:** ناهومێد، بێ هەویا.

**هیوابڕاو:** هەناسە سارد، پشت سارد.

**هیوی** (شکا.): هێڤی، تکا.

**هیوێن:** بڕوانە: هەوێن.

# ی

**ی:** دوا تیپی ئابێی کوردییە. ئەو، وی (بۆ یەکێکی نەدیوە بە دوای وشانیشەوە دەنووسێ و دەشکەویتە نێوەڕاستی وشانیشەوە): دەنووسێ، بیدەیە. بۆ دانە پاڵ و خستنە سەر: کتێبی من. لە موکریانێ بۆ بەندیواری بەدوای وشانەوە دەنووسێ وەکو: ئەو پیاوەی، ئەو کارەی. جێناوی نادیار وەکو: بابی. خواردی. بۆ هەندێ سەرچاوە بەکاردێ وەک: دۆستی، برادەری. بۆ ــ وەکو: سابلاخی، بارزانی ــ وەکو: هەوای بەهار. کوردی کوردستان. داماوی موکریانی. ــ ی نادیار بۆ یەک کەس یا یەک چت: پیاوێ، تاوێ.

**یا:** لە شوێنی کورت کردنەوە: یاگە، یان، ئان، یاخۆ. (ئاک.، ئامێ.) ها، ئاها (بۆ راقمانە). (بار.) دبێنێ بەسێ: ئەوی پێ ی دەڵێن بەسێ. یان، ئان. (خۆ.، باک.) مرازی خاوەندێتی و تایبەتێتی: ــ من: هی من.

**یێ:** پەسوەندی وشەی: کچێ، دایکێ، خۆشکێ، دێدێ، پەورێ و هتد. تەنها بۆ مێ ینانە و نیشانەی مێ ینانە. زۆرتر لەکاتی بانگ کردندا بەکار دەبرێ وەکو کچێ: هۆی کچ. دێدێ: هۆی دێدە. لە شێوەی هەورامی دا بۆ گەلە وەکو: گۆیشوارێ: گوارەکان. وەرێ: بەرخەکان. بزنێ: بزنەکان.

**یابوو** (کە.، ڕۆژ.، فە.): بارگین.

**یاتوو** (ئاوێ.): جادوو.

**یاخۆ:** یا.

**یاخێتی:** هەڵگەڕانەوە، زیت بوونەوە، قاچاخی.

**یاخە** (فە.): یەخە، یەقە، بەرۆک، ئێخە.

**یاخی:** پەت پساندن، بارنەبردن، ئازادی خوازتن، سەرکێشی، بەزاج، لامۆخەک، ختمی، هەج، دانەساخ. قاچاخ:کەڵەمەشکێن: گوونەرەش: گوونک.

**یاد:** (فە.) هوور. (باک.) بیراهی. (باد.) هزر. (هەورا.) ویر. ئاسە، چێل، بیر، بەر، هویر. ــ کردن: چێل کردن. کردنەیاد: لەبەرکردن. وەیاد هێنانەوە: وەبیر هێنانەوە. لە ــ دابوون: (باک.) پیرۆ مێژوولی.

**یادگار:** (باک.) بیرهاتی، سەربۆری.

**یادێ** (بۆتا.): دایک، (لەکاتی بانگ کردنێدا).

**یار:** دۆست، دڵدار، یۆو.

**یارا:** توانایی، لێهاتوویی.

**یارای** (هەورا.): وێران، توانین، توانایی. نە ــ: نەتوانین، نەوێران.

**یارەڵمەسی:** پەتاتە، کرتۆپە، رتاخ، کارتۆل، سێڤەزەمینی، خرکە گازۆڵە.

**یارەما** (ئەردە.): برکەی هاروێ و ترێزوو.

**یارمەتی:** یاریکاری، ئاری، یاری، هاوپشتی، کۆمەگی، خەرمانلۆخە. ــ دان: ئاوڕ لێ دانەوە. هاوپشتی دان. ــ کردن: زچ کردن. چاوەدێری، یاریدە، یاریە.

**یاردووم:** یاریدە.

**یارۆ:** گۆرین، هێما بۆکراو، باس کراو، ناوبراو.

**یاری:** یارمەتی، گەمە، گاڵتە. ــ کردن: (باد.) یاری کرن، لێزین.

**یاریدە:** یارمەتی، یاریکاری، هاری، هاریکاری، دەستیار، یاردوم، یاریە. (هەو.) زیارە، گەل کردن. (دەر.) هامەیاری، یاری. ــ دان: خۆدانە بەربار، ئاوڕ لێدانەوە، هاوڕ لێدانەوە، سەراسوێ کردن.

**یاریدەدان:** باربوو، یارمەتی یەکتری دان.

**یاریدەدەر:** یارمەتی دەر، یاریکار، یاریکەر، (باک.) ئاریکار.

**یاریکار:** یاریدەدەر، یارمەتیدەر، (باک.) ئاریکار. (هەو.) زیارە، گەل. (باک.) یارمەتیدان، گەمەکەر. ــ ی: ئاریکاری، هەرەوەز، یارمەتی، زیارە، گەل کردن، هاریکاری.

**یاریگە:** گۆرەپانی یاری کردن، شوێنی یاری کردن.

**یاس:** جێگای زۆر سەخت و تووش لەکێواندا. یاسەمین.

**یاسا:** یاسە، ڕێ و شوێنی و ڕەفتاری باب و باپیران، خوو، داب و نەرێت، بنەما، ڕێک خستن، بنەڕەت. ــ کۆ: تۆمارکردنی یاسا. ــ ی بنەڕەتی: ڕێ و شوێنی بنەما.

**یاساخ:** قەدەغە، یەساخ، قۆرخ. ــ کردن: قەدەغەکردن.

**یاساوڵ** (کە.، جا.، کۆ.): کێشکچی، ئێشکچی، پاسەوان.

**یاسەمەن:** یاسەمین، (باک.) ئەسمین، مەران، ئاسمین. دارێکە بە گوڵەکەشی دەڵێن ــ. نێوی ئافرەتانە.

**یاسەمین:** یاسەمەنە.

**یاسەی سەخت:** بەردی سەخت و بڵند. بەردی ڕەق. گاشەبەرد.

**یاشتن** (کەل.، فە.): ژیان.

**یافا:** قسەی ناراست.

**یافت:** نیشان، شوێنەوار.

**یاقما**: تالان.

**یاقووت**: (باک.) یاگەنە، ئاقووت، یاخەنە. (بابا.) ـــ ی: جووره تریّ یەکە. وەکو رەنگی یاقووت.

**یاقووتی زەرد**: (باک.) بەر زەرین.

**یاک**: داک، دایک.

**یاکردن**: بەقسەکردن.

**یاکۆ** (باک.): یاخۆ، یا، ئەو شتەی.

**یاگە** (هەورا.): جێگا، جێگە.

یاگی

**یاگی** (باڵە.): ئاور، ئاگر.

**یال**: (رۆژ.): بڕ، بڕی، دەهف، ژە، ژیی، یال و بڕ. (جا.) گرد و تەپۆلکەیە. (رۆژ.) ریگا و بەرزایی سەرشاخ و کێوانە. تووکە درێژەکەی سەرملی ولاخی بەرزەیە.

**یال و بڕ**: یال. مووی سەرملی ئەسپ و شێر. مووی سەری ئالۆزاو.

**یام** (هەورا.): یا، یان، ئان.

**یامە** (ئاوێ.): جام، شووشە. (ی یەکە بۆتە ج).

**یان**: یا، یاخۆ. (بابا.) دان، پێدان. (لە ئەدیوی دوان). خانوو، ماڵ.

**یانە** (شەبە.، زا.): هۆرگە، خانوو، ماڵ.

**یانزدە**: یازدە.

**یانزدەم**: یازدەهەم.

**یانزدەمین**: یازدەهەمین.

**یانگزە**: یازدە.

**یانگو** (باک.): یا، یانی، واتا.

**یانی**: ئانکوو، ئانگۆ. ئەکاو، لەپڕ.

**یانی گر**: (زا.) نیمیگیر. نهێنی گیر، دیان گیر، لاگیر، نیان گیر، نهێنبڕ، نهان گیر، پاشدڕ، پاشگر. سەگێکە لە نەکاو و لەپڕا خەلکی بگری.

**یاو** (هەورا.): تا، نۆبەتی. (باڵە.) ئاو. گەیشتن. بیرەوەری.

**یاوا** (هەورا.): گەیشت.

**یاوان**: بیابان، چۆل. گەیشتن.

**یاوای** (هەورا.): گەیشتن، هاتن. بۆ میوەش دەبێ.

**یاوەر** (هەورا.): هاوالّ مندالّ، پایەیەکی پێشمەرگەیەتی یە. نێوی پیاوانە.

**یاولەرز** (هەورا.): تاولەرز.

**یاونای** (هەورا.): گەیاندن.

**یاو و تاو**: گەرمی تا.

**یای**: (هەورا.) بانوو. خات، خانم. لە پێش میدیەکاندا کورد بۆ رێزی ژنان بەکاریان دەبرد. ئێستاش لە نێو هۆزی مەنگوڕ و گەورکاندا بەو چەشنی بەکاردەبرێ. (کۆ.) دیدە (بۆ خوشکی گەورە بەکاردەبرێ).

**یایانە**: بانووانە، خاتانە، خانمانە.

**یایە**: دایک.

**یایک**: پوور. دایک.

**یایکزا**: پوورزای دایک.

**یایێ**: نێوی ئافرەتانە.

**یە** (فە.، هەورا.، کەل.): ئەوە. (موک.) وە. (دەر.) ئەست، گەورەیە گەورەست. وە.

**یەخ** (هەورا.، فە.): سەهۆڵ.

**یەخە** (کە.): ئێخە، بەرۆ.

**یەخە دادڕای** (هەو.): جووره گەفێکە لە سێ جوورەکانی قەندەهاری.

**یەخ بەندان** (هەورا.): یەخ بەنان. (زەن.) ماسیان، سەهۆڵ بەندان.

**یەختە**: (باک.) ولاخێکە خەسابێ، ئێختە.

**یەخترمە** (باک.): تالان.

**یەخدان**: ئێغدان.

**یەخسیر**: ئێخسیر.

**یەخنی** (رەوا.، هەورا.): خۆرشت.

**یەدەگ** (کە.): دەژ، نوستوو، پێش بین، دووربین، تێ بینی. (باک.) ئەردەک، ئیردەک. منیەک.

**یەر** (تی.): زین.

**یەرەق** (هەورا.): دەندە، هەوجاڕ. (فە.) چەک.

**یەرێ** (هەورا.): سێ، یەری.

**یەز** (ئاوێ.): رێز، پەرستن.

**یەزەتە** (ئاوێ.): پەرستراو، خوا.

**یەزدان**: خودا، خولاّ. (لە ئێزدەوەیە).

**یەزیدی**: داسنی.

**یەسەخ** (باک.): یاساخ.

**یەسە** (کەل.): ئەوەتا، ئەمە، ئە ئەوەتانێ.

**یەشە** (هەو.): بۆ ئاژۆتنی بزن و گوێدرێژە بەکاردەبرێ.

**یەشەهێ** (دزە.): بزنە گەلی پێ دەگەڕێتەوە.

**یەشەیەش**: بۆ راگرتن و ئاژۆتنی بزنان بەکار دەبرێ.

**یەشم** (هەورا.): بەردێکی نەرمە پیالە و چتی دیکەی لێ دروست دەکرێ.

**یەغە**: زیندەوارێکە لە نێوانی سەگ و پشیلەی دا، چوارپەلی کورتن و رەنگیشی بۆرە.

**یەغنی کێش**: جووره قابێکە.

**یەڤە** (ئاوێ.): جۆ، (ی بۆتە ج).

**یەڤەنیتات** (ئاوێ.): جاوید. (ی بۆتە ج).

**یەڤەن** (ئاوێ.): جووان. (ی بۆتە ج).

**یەقە** (کە.): ئێخە.

**یەک**: یێک، ئێک، یەی. (هەورا.) یۆ. (۱) ـــ تەبا، جووت، رێک، ئارام، ئاشت. ـــ گرتن: هەڤدان. یەکایەک: (باد.) یەکیەکە. لەگەڵێک جێگایاندا مانای پێکەوە دەدا. ئەڤ یەک. ئەمەوە، هۆوە. ژبەر ڤێ یەکێ لەبەر ئەوەی. بە ـــ ەکەوە: پێکەوە، تێکرا.

**یەک ئاهەنگ** (باک.): یەک دەنگ.

**یەکاڵە** (بابا.): یەتاڵووکە، قەڵشتن. دوو پارچە و شەق کردن.

**یەکانە**: تاکانە، بەرازی نێرەیە. برە، تاقانە. (زمن.) یەکتا.

**یەکانی** (باک.): یەکتایی، یەگاتەی.

**یەکاو**: ئەو حاستەیە، کە دوو جۆگە یا چۆم یا زێ ی تێدا وێک دەکەوێتەوە.

**یەکاوە** (هەورا.): قوبولّی، جوورە پلاوێکە. دەم پوخت.

**یەکاویەک**: لە هەوەڵجاردا بە سوودە. یەکەیەکە. بۆ یەکەم جار. هەر ئەودەم، پڕ بە پێست.

**یەکەدار**: پیاوێکە تەنها وڵاخێکی هەبێ و چەند وڵاخێکی دی لە یەکێکی دیکە وەرگری و بەتێکەڵاوی کاسبیان پێوەبکا، بەرێ چوونی خۆی و وڵاخەکەی لەسەر خاوەند وڵاخەکانە و قازانجی وڵاخەکەی خۆشی بۆ خۆیەتی.

**یەکەر** (باک.): نێوان، ماودا، ماوە.

**یەکەڵگوون**: قۆرێکە تەنها گونێکی هەبێ.

**یەکەندەر دوو**: لەناکاو، لەپڕا.

**یەکەیەکە**: تاک تاکە، تاق تاقە، تاق و لۆق، کەتکەتە.

**یەکباد**: یەکتەن، تەنک.

**یەکباڵ**: یەکتەن، یەکباد.

**یەکبان یەک**: کۆبوونەوە، وەسەر یەکدابوون.

**یەکبەرخ**: مەڕێکە یەک جار زابێ.

**یەکبەند**: نەوەند. گوێلکی یەک ساڵانەیە.

**یەکبڕ**: جوانوێکە ساڵێکی تەواوبێ تەمەنی و پێی نابێتە ساڵی دووەمییەوە.

**یەکبینە**: بێ برانەوە، بێ وچان، هەمیشە.

**یەکتا** (ژا.): خودا، خوا، خولا. یەکانە، تاق و تەنیا. تاک. بێ هامپا، بێ هەڤبەر، بێ هەمبەر، بێ هاوشان، بێ هاوتا.

**یەکتەن**: یەکباڵ، تاق و تەنیا و بێکەس. بەتەنهایی، بەتاقی تەنێ، بێ یاریدەدەر. یەکباد.

**یەکتر**: هەردوو، هەڤ. ـــ دواندن: گفت وگۆکردن.

**یەکجار**: ئێجگار، تەواو.

**یەکجۆر**: وەک یەک. هاوبەشی لە ڕەفتار یا ڕەنگ و قەبارە و تام و بۆن و ئیتر.

**یەکچاڤ**: یەکچاو، یەکلەچاو.

**یەکچەلی**: ئێجگاری.

**یەکخستن**: یەک گرتن.

**یەکدان**: دانەیەک، بەیەکتردان، نیو ڕۆژ.

**یەکدەست**: یەکگرتوو، یەکدڵ. (باک.) چۆنە.

**یەکدەستی**: یەکێتی.

**یەکدەنگ**: یەک ڕا، یەک بیر، یەک ئاهەنگ.

**یەکدڵ**: یەکدەست.

**یەکدی**: یەکتری.

**یەکرەنگ**: سادە، یەک ڕوو. ـــ ی: سادەیی، یەکڕوویی.

**یەک ڕوو**: ڕاست، ڕاستگۆ.

**یەک زوان** (کە.): یەک زمان.

**یەکسا**: یەکرەنگ.

**یەکسان**: وەکوو یەک، بەرامبەر یەک، یەک ئاست، یەک پلە.

**یەکسەر**: بەخێرا، بێ چەند و چوون، بێ بیرکردنەوە. بێ ڕاوەستان، یەک شەق.

**یەکسەرە**: خۆکرد، بێ پرس، مەیانەیی، ڕاستەوخۆ.

**یەکسم**: وڵاخی بەرزە و گوێدرێژ.

**یەکشەمە**: یەک شەمۆ، کیراکی.

**یەکشەق**: یەکسەر.

**یەکشەمب** (باک.): یەک شەمە.

**یەک شەمە**: یەک شەوە.

**یەک شەوە**: مانگی یەک شەوە.

**یەک شێوە**: یەک وێنە، یەک جۆر.

**یەک کەوتن**: یەک گرتن.

**یەک کەوتوو**: یەک گرتوو، ڕێکەوتوو، پێڕەو.

**یەک گرتن**: هەڤدان، هاودڵ بوون، یەک کەوتن، هەڤدل.

**یەک گرتوو**: یەکدەست، هەڤاڵ بەند، بێ هەمبەر.

**یەکلا**: وەراست گیراو. پیاوەتی ڕاست و دروست. ـــ کردنەوە: (فە.) یێلاکردنەوە.

**یەکلابوون**: دڵنیابوون.

**یەکما** (خۆ.): بەلا قۆقزە بەرینەکەی جگی دەڵێن.

**یەکمان** (باک.): سەرۆک، پێشەوا، گەورە.

**یەک لەسەریەک**: لەسەریەک کەوتن و کۆبوونەوە.

**یەک و دوو**: تاق و جووت، تاق تاقە، تاک تاکە.

**یەکیەکە**: تاک تاکە.

**یەکێتی**: یەکیەتی، یەکەتی، فەرکبوون. هاودڵی، هەڤدلی، بێ هەڤبەری، هەڤداتی. یەک کەوتن، یەک گرتن، هەڤاڵبەندی، پرس دان هەڤ. (باک.) ئێکێتی، پێڕەوی.

**یەکێک**: یەک کەس، تاکەکەس.

**یەکینی** (کۆ.): (باک.) یەکێتی. (موک.) زەقاڵێن. جوورە گەمەیەکە.

**یەلەک**: ئێلەگ، یەلەگ، سوخمەی ئافرەتانە.

**یەڵدا**: یەکەمین شەوی زستانە، کە درێژترین شەوی ساڵە.

**یەڵغار**: هێرش بردنی سوارانە.

**یەلوم**: چۆڵەچرا.

**یەم**: دێم، تێم.

**یەمە** (فە.): ئێستە، هەنوکە، هەنکە، نهۆ.

**یەن**: هێندە. سەروچاوە، هانە. دێن.

**یەنە**: ئینی، هەینی، جوعمە، جومعە.

**یەندە:** ئەوەندە، هێندە.

**یەنگۆ کەردەی** (هەورا.): لاسایی کردنەوە.

**یەنگێ** (هەورا.): لاسایی.

**یەنو:** ئەمان، ئەمانە.

**یەو** (هەورا.، کۆ.، زەن.): جۆ.

**یەواش:** هێواش.

**یەوە** (هەورا.): یەک.

**یەونان:** وولاّتی یۆنان.

**یەونانی:** جورە تفەنگێکە.

**یەوی، یەوەی** (هەورا.): جۆ.

**یەهـ:** هۆ. بۆ ڕاگرتنی ولاّخانی بەرزە بەکار دەبرێ.

**یەهەر** (هەورا.): جەرگ.

**یەی** (کەل.): یەک.

**یۆ:** یەک، ئەو.

**یۆتەر** (هەورا.): یەکێکی تر.

**یۆخلەمە:** لەدروگەڕان.

**یۆر** (هەورا.): کۆن، دۆست.

**یورت:** جێگەی لەوەڕاندن.

**یوزنە:** قایشی جووت.

**یوم:** ودم، بیرۆزی، مومبارەکی، پیرۆزی.

**یۆم:** ئۆغر، ودم، پیرۆزی.

**یۆمە:** رۆژانە. کرێی رۆژانە.

**یۆنە** (هەورا.) کۆن: من، منم.

**یێ** (باک.): ئێ. (شکا.، باد.، نەهـ.) مرازی خستنەسەرە بۆ نێر: برێ من، بابێ من. بەلاّم تەنها لەم چەند وتانەدا بۆ مێ یانە: جانێ، عەزیزێ. لەبانگ کردندا بەکاردەبرێ.

**یە:** ئەمە، ئێک.

**یێ:** هی، لەیی: لەهی. ــ منە: مالّی منە.

**یێت** (شکا.، باد.، نەهـ.): ئان، بۆگەلە. مریشکێت سپی: مریشکە سپیەکان. پەزێت من.

**ییخ:** بۆ ئیخدانی وشتران بەکاردێ. نیشاندنی وشتر چەند جاران دوپاتی دەکەنەوە. بۆ ئاژۆتنی مەڕ و بزنان. ــ خواردن: ییخ بوون، هاتنە سەرچۆکان.

**ییخە:** (کە.) حێلە، حێن. ئێخە، جج، چتت، چتتە، ییخەییخە، بۆ لێخوڕین و بۆ دەرکردنی بزنان و کاریلان بەکاردەبرێ.

**ییخدان:** ئیخدانی وشتر.

**یێک:** یەک.

**یێلاکردنەوە** (فە.): یەکلاکردنەوە.

**یێن** (باک.): بۆگەلە. مێرێنەمەزن: پیاوانی گەورە.

**یێش:** نێش. ــ ان: ئێشان. ــ اندن: ئێشاندن.

**یێکەلّ** (موک.): ئاژاڵێکە گوانێکی وشک بووبی. کەرگوان، ییکەلەگوان.

**یێکەلّە گوان** (هەورا.): یێکەلّ.

**ین:** نیشانەی چاوگە وەک: دابەزین، پێکەنین، فڕین.

**یـن** (باک.): مرازی خستنە سەری کۆیە لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا: ژنێن گوند: ژنانی گوند. دێن، تێن.

**یینە:** ئەوان، وان.

**یێنی:** یینی.